لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

پڕۆفیسۆر قەناتی کوردۆ
(کوردۆییڤ)

# هەندێك بیر و باوەڕی هەڵە
# لە بارەی زمان و مێژووی کوردەوە

وەرگێڕان و پێشەکی
د. عەورەحمانی حاجی مارف

پیاچوونەوەی
د. کەمال مەزهەر

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد
بەغدا ـ ١٩٧٣

# پێشەکی

خوێندەواری بەڕێز !

دەمێکە بە ئاواتەوەم کارە زانستیە گرنگەکانی مامۆستا قەناتی کوردۆ (کوردۆییێڤ) وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی ، بەڵام ئەم کارە ئاسان نییە ، چونکە ئەوەی ئەو نووسیویێتی بە ساڵ و دوو ساڵ و بە یەك کەس ناگۆڕدرێنە سەر هیچ زمانێك و وا من ئەم هەنگاوەم ناوە کە هیوامە هەنگاوی تری لە دوا بێ .

ئەم نووسراوەی دەیخوێنیتەوە لە پێنج وتار پێکهاتووە کە بریتین لە رەخنەی زانستی لەو بیر و باوەڕە چەوت و ناڕاست و دوور لە زانیارییانەی لە بارەی زمان و مێژووی گەلی کوردەوە بڵاوکراونەتەوە . هەرچەندە وتاری یەکەمی ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩٥٤ و وتاری دووهەمی لە ساڵی ١٩٥٥ دا بڵاوکراونەتەوە و بەم جۆرە ماوەیەکی زۆر بە سەر نووسینیاندا تێپەڕیوە ، بەڵام تاکو ئێستا نرخی خۆیان لەکیس نەداوە . وتاری سێهەم تەنها کورتەیەکی لە ساڵی ١٩٦٩ دا بڵاوکراوەتەوە ، بەڵام ئێمە وامان بە پێویست

زانی که دەستنوسەکەی وەرگێڕین نەك کورتەکەی و هەرچی وتاری چوارەهەم و پێنجەهەمیشە وا بۆ یەکەم جار بە کوردی چاپ دەکرێن و ئەوەش بێ‌گومان نرخێکی تایبەتییان پێ دەدا . تاقە هیوام ئەوەیە بەم کارەم توانیبێتم خزمەتێکی بچوك پێشکەش بە زانیاری گەلەکەمان بکەم و پڕ بە دڵ سوپاسی کۆڕی زانیاری کورد دەکەم کە ئەرکی بڵاوکردنەوەی گرتە ئەستۆی خۆی .

* * * * * *

# سەرنجێك لە کارە زانیارییەکانی مامۆستا قەناتی کوردۆ

تاکو ئێستا چەند وتارێك لە بارەی مێژوی ژیانی پرۆفیسۆر ق . کوردۆوە بڵاوکراوەتەوە[1] . هەرچەندە ئەم جۆرە نوسینانە گەلێك پێویستن و بایەخی خۆیان هەیـە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا بە لێکوڵینەوەیەکی زانستی دانانرێن . جا ئێمە لە بـــەر ئـــەو دو هۆیە و چەند هۆیەکی تر[2] بە پێویستی دەزانین زۆر بە کورتی لە کارە

---

(۱) یەکێك لەو وتارانەی لە بارەی مێژوی ژیانی پرۆفیسۆر ق . کوردۆوە نوسراوە وتارەکەی د. مارف خەزنەدارە ، کە لە لاپەڕەی ( ۳۷ - ٤٤ ) ی ژمارە (۱)ی گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » دا لە ژێر ناوی « زیانی کوردناس و زانایانی کوردی ئەوروپا » دا بڵاوی کردۆتەوە .

(۲) یەکێك لەو هۆیانە ئەوەیە کە کارە زانستیێکانی ق . کوردۆ ، وەپلەی بەرزی ئەو کارانە لە زوربەی خوێندەوارانی کورد ئاشکرا نین .

زانستییەکانی ق . کوردۆ بکۆڵینەوە[٣] .

ژمارەی کارە زانستییەکانی مامۆستا کوردۆ (وتار و نامیلکە و کتێب) لە (٨٠) تێپەڕ دەکات کە تاکو ئێستا نزیکەی (٦٠)یان لێ بڵاوکراونەتەوە و هەموویان لە بارەی زمان و مێژوو و ئەتنۆگرافیا و فۆلکلۆر و ئەدەبی گەلی کوردەوەن ، زوربەیان بۆ لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی تەرخان کراون ـ واتە نوسینی ڕێزمانی کوردی (تیۆری و پراکتیك) ، لێکۆڵینەوە لە زمانی گفتوگۆ و لە زمانی ئەدەبی ، بەراوردکردنی دیالێکتی کرمانجی ژوورو و خواروو ، دانانی فەرهەنگی کوردی ـ ڕوسی و ئەو بابەتانە .

لەم ڕووەوە مامۆستا ق . کوردۆ خزمەتێکی گەورە و شایانی زمانی کوردی کردووە و کوردناسانیش دانیان بەم ڕاستیەدا ناوە . ساڵی ١٩٤٩ مامۆستا کوردۆ کتێبێکی ڕێزمانی کوردی لە چاپدا[٤] و ساڵی ١٩٥٧یش بە زمانی ڕوسی کتێبێکی تری هەر لە بارەی ڕێزمانی کوردییەوە بڵاوکردەوە[٥] . گرنگی ئەم دوو کتێبی ڕێزمانە تەنها لەوەدا نییە کە بۆ یەکەم جار لە سۆڤێت و لە مێژووی کوردناسیدا لە

(٣) زۆری کارە زانستیکانی مامۆستا کوردۆ ناچارمان دەکات لەم پێشەکییەدا زۆر بە کورتی لێیان بکۆڵینەوە ، ئەگینا لەوانەیە پێشەکییەکە لە ناوەرۆکی کتێبەکە زیاتر دەربچێ .

(٤) ق . کوردۆ ، ڕێزمانی زمانی کوردی ، (بە زمانی کوردی) ، چاپی یەکەم ، یەریڤان ١٩٤٩ .

(٥) ق . کوردۆ ، ڕێزمانی زمانی کوردی ، (بە زمانی ڕوسی) مۆسکۆ ١٩٥٧ .

سەر شێوەیەکی زانستی کتێب لە بارەی زمانی کوردییەوە بڵاوبکرێتەوە ، بەڵکو سەرەڕای ئەوەش توانرا لەم دوو کتێبەدا گەلێك کاری ئاڵۆز و نائاشکرا لە ڕێگایەکی زانستییەوە خاوبکرێتەوە و ئاشکرا بکرێ ، وەك : دۆزینەوەی نێر و مێ و دابەشکردنی ناو بە سەریاندا ؛ خاوکردنەوەی هەندێ ئاڵۆزی لە ڕەگی کردار و لە پێشگر و پاشگردا ؛ شێوەی کرداری (متعد transitive) لە کاتی رابوردوودا ؛ هەروەها گەلێك مەسەلەی گرنگیتر کە تا دەرچوونی ئەم دوو بەرهەمەی مامۆستا کوردۆ باش لێیان نەکۆڵرابۆوە .

بە سەرنج دانێك لەو وتارانە کە لە بارەی ئەم دوو کتێبە و لێکۆڵینەوەکانی تری ق. کوردۆوە لە لایەن کوردناسان و شارەزایانی سۆڤێت و دەرەوە نوسراون نرخی ئەو کارە زانستیانەمان بە باشی بۆ دەردەکەوێ . ئی. ئی. تسوکەرمان لە بارەی کتێبی یەکەمی ق. کوردۆوە نوسیویێتی دەڵێ : « سەرکەوتویی ئەم کتێبە لەوەدایە کە لە سەر ڕێگایەکی زانستی نوسراوە . ق. کوردۆ نەك تەنها لە زمانی کوردی کۆڵیوەتەوە ، بەڵکو لە هەمان کاتدا ڕێگای لێکۆڵینەوە و فێربوونیشی نیشان دەدات»[6] . هەر ئی ئی. تسوکەرمان لە پێشەکیی یەکێك لە کتێبەکانیدا ئەم بیرەی لە بارەی کتێبی دووەمی قەناتی کوردۆوە دەربڕیوە : « بێهاوتایی ئەم کتێبەی ق. کوردۆ لەوەدایە کە یەکەمین کاری زانستییە لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی ڕێزمانی زمانی

---

(٦) بڕوانە : کتێبی « کارەکانی ئامۆزگای زمانەوانی » ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢ ، ب ٥ ، ل ٣٧ .

کوردیدا . هەروەها بێهاوتاتی لەوەشدایە کە سەرچاوە و کەرەستەی زۆری بەکار هێناوە و گەلێك کاری گرنگی ناشاشـــکرای هەست پێنەکراوی رۆن کردۆتەوە »[٧] .

دوکتۆر باکایێڤیش لە وتارێـکی تایبەتی خۆیدا بە درێژی ئـەو دوَ کتێبەی نرخاندوە[٨] . هەمان پسپۆڕ لە وتارێـکی تریدا لە بارەی ئەو دوَ کتێبەوە نوسیویێتی دەڵێ : « لە چاپدانی دوَ کتێبی رێزمانی زمانی کوردی بە کوردی و بە روَســـی پێشکەوتنێـکی گـەورەیە لە کوردناسیدا . نوسەری ئەم دوَ کتێبــە ق . کـوردۆی کوردناسی بەناوبانـگی سۆڤێتە . ئەم نوسراوانە چ لە روَی زۆری بەکارهێنـانی کەرەستەی زمان و شێوەی دارشتنێوە و چ لە روَی لێـکۆڵینـەوەی فراوانـ و ورد و قوڵیەوە جیاوازی زۆرە لەگـەڵ هەمو ئـــەو رێزمانانەی بـەر لەوان لە سـەر زمانی کوردی دانراون . بە باوەڕی ئێمە لەم دوَ کتێبەدا بۆ یەکەم جار تواناوە بە شێوەیەکی راســـت (جگە لە چەند شوێنێك) لەو مەسەلانە بکۆڵرێتەوە کە زوَ لە هیچ رێزمانێـکی کوردیـدا باســـیان لێـوە نەکراوە . لە کتێبی رێزمانی ١٩٥٦ دا[٩] کە بۆ پۆلەکانی ٥ ـ ٨ ی قوتابخـانە کوردێـکان دانراوە

(٧) ئی . ئی . تسـوکەرمان، رێزمانی زمانی کـوردی ، مۆسـکۆ ، ١٩٦٢ ، ل ٢١ .

(٨) بڕوانـە : گۆڤاری « رۆژهەلاتناسـی سـۆڤێت » ، ١٩٥٨ ، ژ ٤ ، ل ١٧٨ – ١٨٠ .

(٩) ئەو کتێبی « رێزمانی زمانی کوردی » یەی لە سـالی ١٩٤٩ دا بلاو کرابەوە ، بۆ جاری دوَهەم لە سالی ١٩٥٦ دا لە چاپ درابەوە ـ واتـە لێرەدا مەبەست چاپی دوَهەمە .

هەمـوو ئەو ناتەواویانەی لە چاپی یەکەمدا هەبـوون لابراون . کتێبی رێزمانی ساڵی ١٩٥٧یش کە بە رووسی نوسـراوە لە چوارچێـوەی قوتابخانە دەرچوە و بە شێوەیەکی فراوانتر لە فۆنێتیك و مەرفوڵۆژیاو هەموو مەسەلەیەکی تری رێزمانی زمانی کوردی کۆڵیوەتەوە ...»(١٠) .

کوردناسـی بەناوبانگی فەرەنسـی رۆژێ لیسکۆ لە وتاری « سەرنجێك لە کارە زمانەوانیـەکانی سۆڤێت » دا (١١) دەربارەی سـێ نوسراوی کوردناسانی سـۆڤێت دواوە کە لە سـاڵی ١٩٥٧ دا بڵاوکراونەتەوە . یەکێك لەو سـێ نوسراوە کتێبی « رێزمانی زمانی کوردی » ی ق . کوردۆیە ، کە لە بارەیەوە نوسـیویتی دەڵـێ : « ئەو کارانەی زمانناسانی سۆڤێت دەربارەی زمانی کوردی نوسیویانە نرخێـکی تێجگار گەورەیان هەیە ..... ق . کوردۆ لە کتێبی ( رێزمانی زمانی کوردی ) دا ئەنجامی رەنجـی چەنـد سـاڵەی لە لێکۆڵینەوەدا پێشکەش دەکا . بنچینەی لێکۆڵینەوەکانی بەراوردکردنی کەرەستەیەکی زۆری زمانە کە لە بەشە دیالێکتەکانی دیالێکتی کرمانجی ژوورو وەرگرتوە . بەکارهێنانی ئەو کەرەسـتە زۆرەی دانیشـتوانی زوربەی هەرێمەکانی کرمانجی ژوورو نوسەری لە لێکۆڵینـەوەکەیـدا سـەرخستوە و کارێـکی وای کردوە بگاتە ئەنجامی بە کەڵك »(١٢) .

---

(١٠) ج . خ . باکایێف ، مێژووی لێکۆڵینەوەی زمانی کـوردی لە رووسـیا و یەکێتی سـۆڤێت ، لە کتێبی « مێـژووی لێـکۆڵینـەوەی زمانە ئێرانیەکان » ، مۆسکۆ ١٩٦٢ ، ل ١١٤ ـ ١١٦ .

(١١) Afrika et Asie , N 51 , Paris 1958.

(١٢) هەمان سەرچاوە .

پاش ئەوەی رۆژێ لیسکۆ بە دوور و درێژی باسی ئەم کتێبەی ق . کوردۆ دەکات و چەند رەخنەیەکی بچووکی لێ دەگرێ ، ئینجا کۆتایی بە وتارەکەی بەم چەند وشەیە دەهێنێ : « ئەگەر ئێمە چەند رەخنەیەکمان لە کتێبەکەی ق . کوردۆ ـ زانای گەورەی پێشکەوتوی بە توانای سۆڤێت گرتبێ و لە چەند شوێنێکدا باوەڕمان جیاواز بێت ، ئەوە بۆ ئەوە نییە کە لە نرخی ئەو کارە گرنگە کەم بکەینەوە ، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە ئەو کارە مەزنە کەم و کورتی تێدا نەمێنێ »(١٣) .

کوردناس تـۆما بوا لە چەند وتارێکیدا دەربارەی ق . کوردۆ و کارەکانی و دەوری لە کوردناسیدا دواوە . رۆژهەلاتناسی فەرەنسەیی ئا . بینینگسین لە وتاری « کورد و کوردناسی لە سۆڤێت »دا(١٤) ، وە کوردناسی سۆڤێت دوکتۆر ئۆردیخانی جەلیل لەم وتارانەیدا : « گەنجینەیەکی بـە نرخ لە کوردناسیدا »(١٥) و « کوردناسی بەناوبانگ »(١٦) و « کوردناسی بەتوانا »(١٧) ، هەروەها گەلێک

(١٣) هەمان سەرچاوە .

(١٤) L'ethnographie Reve de la Societe d'ethnographie de Paris 1963 , PP. 71 - 125.

(١٥) بڕوانە : رۆژنامەی « کۆمۆنیست » ( بە زمانی روسی ) ، یەریڤان ١٦/٥/١٩٦٣ .

(١٦) بڕوانە : رۆژنامەی « ئەفەنگارد » ( بە زمانی ئەرمەنی ) ، یەریڤان ٢٥/١٠/١٩٦٩ .

(١٧) بڕوانە : رۆژنامەی « رێیا تازە » ( بـە زمانی کوردی ) ، یەریڤان ١٢/٩/١٩٦٩ .

زانای تر باسی کارە زانستییەکانی ق . کوردۆیان کردوە .

هەرچەندە ئەو دوو کتێبی رێزمانە کە لە سەر شێوەیەکی زانستی و کەرەستەیەکی فراوان نوسراون و کەم و کورتییان زۆر کەمە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەر جارێك کە لە چاپ دەدرێنەوە دانەرەکەیان گەلێك فراوانتریان دەکات و بە شێوەیەکی جوانتر و راستتر دایان دەڕێژێتەوە ، لەبەر ئەوە چاپی یەکەمی « رێزمانی زمانی کوردی » کە لە ساڵی ١٩٤٩دا دەرچووە گەلێك جیاوازی لەگەڵ چاپی چوارەمیدا هەیە[18] . ئەو چوار چاپەی ئەو کتێبە کە بە زمانی کوردی دەرچوون دەورێکی گەورەیان لە ناو قوتابخانە کوردییەکانی ئەرمەنستانی سۆڤێتدا بینیوە . مامۆستایانی زمانی کوردی ئەو قوتابخانانە زۆر بایەخیان داوە بە کتێبەکانی ق . کوردۆ بەتایبەتی چونکە بە شێوەیەکی ئاسان و رەوان نوسراون . نوسەر لەم کتێبانەیدا گەلێك زاراوی جوانی بەکارهێناوە ، وەك : جێناف « ضمیر » ، تەواندی « غیر مباشر » .... هتد . بەلام بەداخەوە لە بەکارهێنانی هەندێ زاراودا وابزانم زۆر سەرکەوتو نییە ، وەك : بۆ زاراوی ( تلفظ ) چوە ( لێوکردن )ی بەکارهێناوە . راستە بۆ ( تلفظ ) کردنی زۆر دەنگ ( لێو ) دەورێکی گرنگ دەبینێ ، بەلام دەنگیش هەن کە بە هاوبەشی زمان و دان دەردەبڕێن . هەروەها

(١٨) کتێبی « رێزمانی زمانی کوردی » کە بە زمانی کوردی نوسراوە و لە ساڵی ١٩٤٩دا لە یەریڤان لە چاپدراوە ، تاکو ئێستا چوار جار ـ لە ساڵانی ١٩٤٩ ، ١٩٥٦ ، ١٩٦٠ و ١٩٧٠ دا لە چاپدراوەتەوە .

لە بریتی (دەنگ) ـ «صوت» ی بەکارهێناوە ، لەگەڵ ئەوەشدا کە (دەنگ) لە کوردیدا دەمێکە چەسپاوە و پڕ بە پێستی خۆیەتی .

هەرچەندە زوربەی لێکۆڵینەوەکانی ناوەڕۆکی ئەو کتێبانەی ق . کوردۆ دەربارەی (فۆنێتیك و مەرفۆلۆژیا و سینتکسیس) ن ، کە گرنگترین بەشن لە لێکۆڵینەوەی زماندا ، بەڵام لە هەمان کاتدا مامۆستا لە چۆنیەتی دروست بون و داڕشتنی وشە «اشتقاق ، تکوین الکلمات Word - Building» یشەوە گەلێك وتاری نوسیوە ، وەك : «دروست بونی کرداری بارگران لە زمانی کوردیدا» [19] ؛ «دروست بونی وشە لە زمانی کوردیدا» [20] ؛ «مانا و فرمانی پاشگری ـ ك ـ (ەکە) لە زمانی کوردیدا» [21] ؛ «پێشگر و پاشگر لە زمانی کوردیدا» [22] .... هتد . لەم وتارانەدا هەمو ئەو ڕێگایانە دیارکراون کە لە زمانی کوردیدا وشەیان پێ دروست دەکرێت . ناوەڕۆکی ئەم وتارانە بە شێوەیەکی کورت و پێویست لە چاپی چوارەمی کتێبی «ڕێزمانی زمانی کوردی» دا

---

(١٩) کورتەی نامەی دوکتۆرێ مامۆستا کوردۆ ، لینینگراد ١٩٤١ .

(٢٠) بڕوانە کتێبی «ڕێزمان و مێژوی زمانەکانی ڕۆژهەلات» ، مۆسکۆ ـ لینینگراد ١٩٥٨ ، ل ١٠٩ ـ ١٤٢ .

(٢١) بڕوانە کتێبی «لێکۆڵینەوە لە مێژوی کولتوری گەلانی ڕۆژهەلات» ، بۆ بیرەوەری ئەکادیمی ئی . ئا . ئۆربیلی ، مۆسکۆ ـ لینینگراد ١٩٦٠ ، ل ٣٦١ ـ ٣٦٨ .

(٢٢) بڕوانە کتێبی «کورتەی دەنگوباسی ئامۆژگای گەلانی ئاسیا» ، ١٩٦٣ ، ژ ٦٧ ، ل ٣٢ ـ ٣٣ .

بڵاوکراوەتەوە .

پاش ئـەوەی ق. کوردۆ دەربارەی ڕێزمانی زمانی کوردی گەلێك وتار و نامیلکە و کتێبی بڵاوکردەوە ، ئینجا لە ساڵانی پەنجادا دەستی‌کرد بە دانانی فەرهەنگێکی کوردی ( دیالێکتی کرمانجی ژووروو ) - ڕووسی و ساڵی ١٩٦٠ ئەم فەرهەنگە کە بەرهەمی ڕەنجی چەند ساڵەی بوو لە چاپدرا [٢٣] . دانانی ئەم فەرهەنگە دەستکەوتێکی گەورەیە لە کاری فەرهەنگ نووسی کوردیدا و هەر لە بەر ئەوەشە کە شوێنێکی بەرزی لە مێژووی فەرهەنگ نووسینماندا وەگرتووە .

نووسەر هەوڵێکی زۆری داوە بۆ کۆکردنەوەی وشە و گەلێك سەرچاوەی هەمە جۆری بۆ ئەم مەبەستە بەکار هێناوە و وشەی لە زوربەی بەشە دیالێکتەکانی کرمانجی ژووروو (وە کەمێك لە کرمانجی خوارو ) دەرهێناوە و بەم جۆرە توانیوێتی دەور و بەری ٣٤ هەزار وشەیەك کۆبکاتەوە کە بەشێکی زۆری وشـەکانی دیالێکتی کرمانجی ژووروو پێك‌دەهێنن و ئەمەش یەکێکە لە هۆی سەرکەوتوویی فەرهەنگەکە کە کەلێنێکی گەورەی لەم مەیدانەدا پڕکردۆتەوە و هەموو کرمانجی ژووروو ( تا رادەیەك کرمانجی خواروش ) گەر پێویستیان بە فەرهەنگی کوردی - ڕووسی بێت ئـەوە بە باشی و بە ئاسـانی دەتوانن لەم فەرهەنگە کەڵك وەربگرن . ق. کوردۆ ئەم فـەرهەنگەی بە پیتی لاتینی لە چاپداوە و ئەمەش بۆتە هـۆی ئەوەی قاڵب و دەنگی

(٢٣) ق. کوردۆ ، فەرهەنگی کوردی - ڕووسی ، مۆسکۆ ١٩٦٠ .

وشه کوردێکان وه‌ك خۆیان بمێننه‌وه .

مامۆستا کوردۆ له چۆنیه‌تی وه‌رگێڕان و لێکدانه‌وه‌ی مانای وشه‌کانی فه‌رهه‌نگه‌که‌یدا له هه‌مان کاتدا هونه‌رێکی به‌رزی نواندوه و به زمانێکی ره‌وان و ئاسان ، به وشه‌ی به‌رانبه‌ری پڕ به پێستی خۆی شه‌رحی وشه‌کانی کردوه و مانایانی لێکداوه‌ته‌وه و هه‌ر وشه‌یه‌ك چه‌ند مانای هه‌بێت هه‌مو ماناکانی به رۆسی نوسیوه ، به‌مه و هه‌روه‌ها به هێنانه‌وه‌ی گه‌لێك په‌ندی پێشینان و قسه‌ی نه‌سته‌ق توانیویتی ده‌وڵه‌مه‌ندی زمانی کوردی نیشان بدا . له لایه‌کی تره‌وه مامۆستا کوردۆ زۆربه‌ی وشه‌کانی فه‌رهه‌نگه‌که‌ی خستۆته رسته‌وه و وه‌ری‌گێڕاون بۆ رۆسی و له‌م رێگه‌یه‌وه تێگه‌یشتن و به‌کارهێنانی وشه‌کانی ئاسان کردوه ؛ خۆ گه‌ر وشه‌یه‌کی کوردی له رۆسیدا به‌رانبه‌ری نه‌بێ ، ئه‌وه به شه‌رحێکی کورت و ئاشکرا مانای ئه‌و وشه‌یه‌ی داوه به ده‌سته‌وه .

زۆر وشه هه‌ن له کوردیدا خاوه‌نی یه‌ك مانان ، به‌ڵام له شێوه‌ی فۆنێتیکیاندا تۆزێك جیاوازي هه‌یه . ق . کوردۆ به پێی توانا و به گوێره‌ی جیاوازی شێوه‌ی فۆنێتیك ئه‌و وشانه‌ی داناوه ، وه‌ك : ( ئامانج ـ ئارمانج ) ، ( ئاڤاز ـ ئاواز ) ، ( ئالی ـ ئاری ) ، ( ئه‌رزان ـ ئارزان ـ هه‌رزان ) .... هتد . بێشك ئه‌مه‌ش یه‌کێکه له روه گرنگه‌کانی فه‌رهه‌نگه‌که .

لێره‌دا پێویسته سه‌رنجیش بۆ ئه‌وه رابکێشین که وا مامۆستا کوردۆ له بریتی پێشه‌کی به رۆسی (ل٦ ـ ١٤) و به کوردی

(ل ١٥ ـ ٢٤) بە کورتی باسی هەمو ئـەو فەرهەنـگە کوردییانەی کردوە کە لە پێش فەرهەنـگەکەی ئەودا دەرچوون و بێ‌گومان ئەمەش کەڵـکی بـــۆ نوسینەوەی مێژوی فەرهەنگ نوسی کوردی زۆرە. هەروەها دانەر لە پەنجا و حەوت لاپەڕەی کۆتایـی فەرهەنگەکەیدا بە کورتی لە ڕێزمانی زمانی کوردیش دواوە و ئەم بەشەش بە تەواوی بە فەرهەنگەکە خۆیەوە بەستراوە و کەڵـکی زۆرە بۆ بەکارهێنانی و بۆ فێربونی زمانی کوردی.

سەرەڕای ئەمانە هەمو کەلێك ڕوی تری گرنگ لە فەرهەنگەکەی مامۆستا قەناتی کوردۆدا بـەدی دەکرێ، هەرچـــەندە ئەمـەش وا ناگەیێنی کە ئەو فەرهەنگە کەم و کورتی تێدا نییە، بەڵام ئەوەندە هەیە کەم و کورتیـیکانی لە نرخی بەرزی کەم ناکەنەوە[٢٤] بەتایبەتی ئەگەر بێتو ئەوەش لە یاد نەکەین کە وا مامۆستا ق. کوردۆ سودی لە تەجـــروبەی فەرهەنگ نوسانی کورد و ئەوروپا وەرگرتوە و ئەمەش بوە بە هۆی سەرکەوتنی فەرهەنگەکە و بە هۆی نوسینی لە سەر ڕێگایەکی زانستی. بەم جـــۆرە ئەم فەرهەنگە بە یەکێك لە فەرهەنگە بەرزەکانی کوردی دەژمێررێت و تەنانەت ئـی. ئـی. تسوکەرمان دەڵـــێ: «گەورەترین نوسراوی زانستییە لە کاری

---

(٢٤) هەر وەك لە ســەرەوە وتمان لەم پێشەکییەدا توانای ئەوەمان نییە بە دور و درێژی لە کارە زانستیـیکانی ق. کوردۆ بکۆڵینەوە. جا هەر لەبەر ئەوەشە کە لە بارەی ئەم فەرهەنگەوە بە کورتی چەند شتێکمان نوسیوە. دەربارەی ئەم فەرهەنگە باسێکی تایبەتیمان هەیە، هیـــوادارم بەم زوانە بـــە چەند وتارێکی تایبەتی بیخەمە بەر دەستی خوێنەرانی بەڕێز.

کوردناسی سۆڤێتدا »[٢٥] .

ق . کوردۆ تا ساڵی ١٩٥٠ تەنها بە لێکۆڵینەوەی دیالێکتی کرمانجی ژوروەوە خەریك بو ، بەڵام لە پاش ساڵی ١٩٥٠وە کەوتە فێربون و لێکۆڵینەوەی دیالێکتی کرمانجی خواروش و ئەمەش زیاتر یارمەتی‌دا کە بتوانی قوڵتر لە زمانی کوردی بکۆڵێتەوە . ئەوە بو لە ماوەیەکی کورتدا توانی گەلێك لێکۆڵینەوە دەربارەی بەراوردکردنی رێزمانی هەر دو دیالێکتی کوردی ( کرمانجی ژورو و خوارو ) بڵاوبکاتەوە ، وەك : « دەربارەی رێزمانی زمانی کوردی »[٢٦] ، « تصریفی کرداری ( متعد transitive ) لە زمانی کوردیدا » ( لەبەر رۆشنایی لێکۆڵینەوەی دیالێکتی کرمانجی ژورو و خوارو )[٢٧] ، « جێ‌ناوی لکاو ( enclitie ) لە زمانی کوردیدا »[٢٨] ..... وە لە ساڵی ١٩٦٥دا کتێبێکی لە چاپدا لە ژێر ناوی « بەراوردکردنی رێزمانی دیالێکتەکانی کوردی » ( کرمانجی

---

(٢٥) ئی . ئی . تسوکەرمان ، رێزمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ١٩٦٢ ، ل ٣٥ .

(٢٦) ق . کوردۆ ، دەربارەی رێزمانی زمانی کوردی ، ( بە زمانی روسی ) ، مۆسکۆ ١٩٦٠ .

(٢٧) بڕوانە کتێبی « وتاری نوێنەرانی سۆڤێت لە کۆنگرەی بیست و چوارەمی رۆژهەڵاتناساندا » ، مۆسکۆ ١٩٦٠ ، ل ٩ .

(٢٨) بڕوانە کتێبی « نوسراوە دێرینەکان و مەسەلەی مێژوی کولتوری گەلانی رۆژهەڵات » ، لینینگراد ١٩٦٥ ، ل٥٦ ـ ٥٧ .

ژۆرو و خوارو )[٢٩] کە بریتیە لە کورتەی نامەی دوکتۆریەکەی کە دەتوانرێ بە یەکەمین لێکۆڵینەوە لە مەسەلەی بەراوردکردنی دیالێکتەکانی کوردی دابنرێت ، ئەویش نەك تەنها لەبەر ئەوەی لەم رووەوە لێکۆڵینەوە زۆر کەمە ، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە تاکو ئێستا هیچ کوردناسێکی تر نەیتوانیوە بەو شێوە زانستییەلەو باسە گرنگە بکۆڵێتەوە و ئەوەندە کەرەستە بە شێوەیەکی وا راست و گونجاو بەکار بهێنێ .

مەبەستە هەرە گرنگەکانی ئەم بەرهەمە زانستییەی کوردۆ بریتین لە دەرخستنی یەکێتی و لە یەکچوونی دیالێکتەکانی زمانی کوردی و دیارکردنی هۆ مێژوویەکانی ئەو جیاوازییە کەمانەی لە نێوانیاندا هەن لە گەڵ نیشاندانی رادەی دەولەمەندیی و پێشکەوتنی ئەم زمانە .

ئەم کتێبە لە سێ بەش پێکهاتوە : پێشەکی ، فۆنێتیك ، مەرفۆلۆژیا .

نوسەر لە پێشەکی کتێبەکەیدا باسی هەموو ئەو نوسراوانە دەکات کە لەسەر رێزمانی زمانی کوردی دانراون و کەم و کورتیکانی دەست نیشان کردون و ئەمەش ئەرکی لێکۆڵینەوەکەی ئاسانتر کردوە .

لە بەشی « فۆنێتیك » دا ـ بە کورتی باسی هەموو دەنگەکانی

---

(٢٩) ق . کوردۆ ، بەراوردکردنی رێزمانی دیالێکتەکانی کوردی ، (کرمانجی ژوورو و خوارو ) ، مۆسکۆ ١٩٦٥ ، ٨١ ل ( کورتەی نامەی دوکتۆری ) .

زمانی کوردیی کردوه و ئەو جیاوازییانەی هەستی پێکردون نیشانی داون و هۆی پەیدابونیانی دەرخستوه .

لە بەشی « مەرفۆلۆژیا » دا ـ باسی هەموو بەشەکانی ( ناو ، جێناو ، ئاوەڵناو ، کردار...ی ) کردوه و بە تەواوی هەموو لێکچونی نیشان داوە و دەری خستووە کە چۆن هەر دوو دیالێکتی کوردیی خاوەنی یەك رێزمانن و لەم رێگەیەوە توانیویێتی ئەو بیرە ناڕاستانە بە درۆ بخاتەوە کە هەر دیالێکتێکی کوردیی بە زمانێکی تایبەتیی دادەنێن ، یا بە دوور لە یەکتر لە قەڵەمیان دەدەن .

ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە گرنگییەکی زۆریان بۆ نزیكخستنەوەی دیالێکتەکانی کوردیی و بۆ دانانی یەك یاسا لە رێزماندا و بۆ پێشخستنی زمانی ئەدەبی یەکگرتوی کوردیی هەیە .

وەك وتمان ئەم کتێبە کورتەی نامەی دوکتۆرێکەیتی ، وە هەر لەبەر ئەوەشە کە گشت سوچێکی زمانی کوردیی نەگرتۆتەوە . بەڵام لە ساڵی ١٩٦٨دا لە نوسینی نامەی دوکتۆرێکەی بووەوە و شەهادەی دوکتۆری علومی وەرگرت . نامەی دوکتۆرێکەی نزیکەی (٦٠٠) لاپەڕە دەبێ و ئێستا لە ژێر چاپدایە . بێگومان وەرگێڕانی ئەم بەرهەمە زانستییە گرنگە بۆ سەر زمانی کوردیی کارێکی پێویستە ، چونکە لەو باوەڕەداین یارمەتیی شارەزایانی کورد بدات بۆ چارەسەرکردنی گەلێك لەو گیر و گرفتانەی لە رێگای زمانەکەماندا هەن .

قەناتی کوردۆ تەنها بە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردییەوە خەریك

نەبووە ، بەڵکو گەلێك بەرهەمی زانستیشی لە بارەی ئـەدەب و فۆلکلۆر و مێژوی کوردەوە بـڵاوکردۆتـەوە ، وەك : « قـەڵای دمدم ـ داستانی قارەمانێتی کورد »[30] ؛ « سیڤا ئاجی ـ داستانی رۆمانتیکی کوردیی »[31] ؛ « چەند بەرهەمێکی فۆلـکلۆری کوردیی » (بە هاوکاری ئی. ئی. تسوکەرمان )[32] . جگە لەم باسانە و گەلێکی تر مامۆستا کوردۆ لە گەڵ دوکتۆرە م. ب. رودێنکۆدا هەندێك پەندی پێشینانی کوردییان وەرگێڕاوەتە سـەر زمانی رۆسـیی و بڵاویان کردۆتەوە ؛ هـەروەها لەگەڵ م. ب رودێنـکۆدا کـتێبێکی گەورەشـیان بە جوتە نوسـیوە کە بریتییە لە بەرهـەمی جیاوازی فۆلکلۆری کوردیی و وەریان گێڕاوەتە سەر زمانی رۆسیی ـ واتە ئەم کتێبە بە کوردیی و رۆسیی‌یە ، وە ئێسـتا لە ژێر چاپدایە و رەنگە بەم زوانە دەربچێ . کوردۆ لەم نوسـراوانەیدا لە ئـەدەبی فۆلـکلۆری کوردیی کۆڵیوەتـەوە و داوا دەکا کە بێوچان و بێدواخستن بەرهـەمی فۆلـکلۆر کە سامانێـکی گـەورەی ئـەدەبی میللەتەکەمانە کۆبکرێتەوە و لە مەترسیی لە ناوچوون رزگار بکرێت .

مامۆستا ق. کوردۆ سەرەڕای ئەوەی خۆی خەریك بووە بە کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و وەرگێڕانی فۆلـکلۆر و ئەدەبی کلاسیکی کوردییەوە ، گەلێك یارمەتیی کوردناسانی سۆڤێتیشی داوە و رابەریی

---

(٣٠) « چیرۆك و گۆرانی داستانی کوردیی » ، مۆسکۆ ١٩٦٢ .

(٣١) هەمان سـەرچاوە .

(٣٢) « زمانە ئێرانیـکان » ، مۆسکۆ ـ لینینـگراد ١٩٥٠ ، ب ٢ .

کارەکانیانی کردووە و لە سەرپەرشتی کردنی ئەم کارانەدا : « مەم و زین »ی ئەحمەدی خانی ؛ « شێخی سەنعان »ی فەقێ تەیران ؛ « لەیل و مەجنون »ی حارسی بتلیسی و چەند کارێکی تری لەم بابەتەدا دەستێکی باڵای هەبووە .

ئەرکی ق. کوردۆ لە خزمەت کردنی ئەدەب و فۆلکلۆری کوردیدا تەنها بە رابەری و سەرپەرشتی و یارمەتییەوە نەوەستاوە ، بەڵکو شانبەشانی ئەوانە هەندێ وتاری گرنگیشی لە بارەی ئەدەبی کوردەوە بڵاوکردۆتەوە ، وەک : بیر و باوەڕی قارەمانێتی لە بەرهەمی ئەدەبی ئەحمەدی خانیدا »[٣٣] ؛ « لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی لە عیراقدا »[٣٤] ؛ « یەکێتی سۆڤێت لە ئەدەبی کوردی دەرەوەدا »[٣٥] ؛ « کوردی سۆڤێت لە ئەدەبی کوردی دەرەوەدا »[٣٦] و چەند وتارێکی تری بەنرخ کە زۆر ڕووی ڕاستەقینەی ئەدەبی کۆن و نوێی کوردیان

---

(٣٣) پێشەکی بۆ کتێبی : م. ب. رودێنکۆ « مەم و زینی ئەحمەدی خانی » ، مۆسکۆ ١٩٦٢ ، هەروەها بڕوانە : رۆژنامەی « چیا » ، ١٩٦٩ ، ژ ٧ .

(٣٤) لە بەرهەمەکانی مامۆستایان : عەلادین سەجادی و رەفیق حیلمی لە بارەی ئەدەبی کوردییەوە دواوە و بە درێژی باسی بایەخ و نرخیانی بۆ کوردناسانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا کردوە .

(٣٥) لە کتێبی « کورتەی وتارەکانی کۆنگرەی زانستی فیلۆلۆژی ئێرانناسی » ، ١٩٤٨ ، ل ٤٥ – ٤٦ .

(٣٦) لە کتێبی « نامەی زانایانی زانکۆی لینینگراد » ، ١٩٥٢ ، ژ ١٢٨ ، ل ١٣٦ – ١٤٢ .

لە قالبێکی زانستیدا خستۆنە بەر چاو .

مامۆستا ق. کوردۆ لە لێکۆڵینەوەی ئەتنۆگرافیای میللەتی کوردیشدا دەستی هەیە . سەرنجێك لەو وتار و لێکۆڵینەوانەی کە لە بارەی خ. ئابۆڤیان و پ لیرخ و ئەمینی عەڤدالّ و گەلێك زانای تر و بەرهەمەکانیان بڵاوی کردۆنەتەوە ئەم راستیە دەردەخات . یەکێك لە بەرهەمە زانستیە گرنگەکانی مامۆستا کوردۆ لەم مەیدانەدا ئەو وتارەیەتی کە لە ژێر ناوی « کورد »دا بڵاوی کردۆتەوە و تێیدا بە گشتی لە ژیانی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و پیشە و زمان و ئەدەب و نەژاد و دروستبون و پەرەسەندنی بزوتنەوەی ئازادی نەتەوەیی گەلی کورد دواوە[37]. ئەم وتارە کورتەی کتێبێکی گەورەیە کە خاوەنەکەی ئامادەی کردوە بۆ چاپ .

لە هەمان کاتدا ق. کوردۆ خاوەنی گەلێك لێکۆڵینەوەیە لە بارەی مێژوی کوردناسی رۆس و سۆڤێت و دەستکەوتە زانستیەکانیانەوە ، وەك : « لە بابەت پێشکەوتنی کوردناسی سۆڤێتەوە »[38] ؛ « کارەکانی پ. ئی. لێرخ لە بابەت کوردناسییەوە »[39] ؛ « خ. ئابۆڤیان وەکو کوردناس و

(٣٧) لە کتێبی « میللەتانی رۆژهەلاتی ناوەراست » ، مۆسکۆ ١٩٥٧ ، ل ٢٤٢ – ٢٦٠ .

(٣٨) « نامەی زانایانی ئامۆژگای رۆژهەلاتناسی » ، ١٩٦٠ ، ب ٢٥ ، ل ٥٧ – ٦٧ .

(٣٩) بڕوانە کتێبی « لە بارەی مێژوی رۆژهەلاتناسی رۆسەوە » ، مۆسکۆ ١٩٥٩ ، ب ٢٤ . ل ٣٩ – ٥١ .

ئەتنۆگراف »[٤٠] ؛ « خ. ئابۆڤیان — زانا و کوردناس »[٤١] ؛ « ئا. ئۆربیلی وەکو کورد ناس »[٤٢] ؛ « کارەکانی ئەمینی عەڤـدال لە بارەی ئەتنۆگرافیای کوردەوە »[٤٣] . . هتد

لەم وتارانەدا مامۆستا ق. کوردۆ نیشانیداوە کە چۆن کوردناسی رۆس و سـۆڤێت لە لێـکۆڵینەوەی مێژوو و ئەتنۆگرافیا و زمان و ئەدەبی گەلی کورددا شوێنێـکی بەرز و دیاری لە رۆژهەڵاتناسـیدا هەیە . هەروەها ئەوەشی دەرخسـتوە کە چون خ. ئابۆڤیان و پ. لێرخ و ئا. ژابا و س. یەگیزارۆف و ئی. ئۆربیلی و گەلێـکیتر لە زانایانی رۆس و سۆڤێت دڵسۆزانە هەوڵیان داوە بە شێوەیەکی زانستی دەوڵەمەندی و سەربەخۆیی زمان و ئەدەبی کوردی و شوێنی کورد لە مێژووی جیهاندا دەربخەن کە ئەمەش بێگومان بایەخێـکی گەورەی لە مەیدانی رۆژهەڵاتناسیدا هەیە .

یەکێك لە رووە هەرە گرنـگەکانی چالاکی مامۆستا کوردۆ لە مەیدانی کوردناسیدا ئەوەیە کە هەوڵی داوە بە پێی توانا هەمو

---

(٤٠) « هەواڵی ئەکادیمیای زانـتی ئەرمەنستانی سۆڤێت » ، مۆسکۆ ١٩٥٥ ، ژ ١٠ ، ل ٨٩ ـ ٩٨ .

(٤١) بڕوانە کتێبی « لە بارەی مێژووی رۆژهەڵاتناسی رۆسەوە » ، مۆسکۆ ١٩٥٥ ، ب ٢ ، ل ٣٦٠ ـ ٣٨٠ .

(٤٢) ئامادە کراوە بۆ چاپ .

(٤٣) بڕوانە کتێبی « نوسراوە دێرینەکان و مەسـەلەی مێژووی رۆشنبیری گەلانی رۆژهەڵات » ، مۆسکۆ ١٩٧٠ ، ل ٥٤ ـ ٥٧ .

لقەکانی دەوڵەمەند بکا و چاوی لە هیچ هەڵەیەکی زانستی نەپۆشیوە، بۆیەکا دڵسۆزانە تەنانەت هاتۆتە مەیدانی مێژووناسیشەوە و چەند وتارێکی لە بارەی مێژووی گەلی کورد و مێژووی زمانەکەیەوە بڵاوکردۆتەوە، وەك : « شێواندنی مێژووی کورد لە زانستی مێژووی بۆرجوازی فارسدا »[٤٤] ؛ « رەخنە لە بیر و باوەڕی هەڵە بەرامبەر بە زمانی کوردی »[٤٥] ؛ « شیکردنەوەی بەڵگەکانی گەزنەفۆن لە بارەی کاردوخەکانەوە »[٤٦] ؛ « چەند تێبینییەك لە سەر کتێبەکەی فیلچێڤسکی »[٤٧] ، « سەرنجێك لە نامەی دوکتۆرێکەی ئاکۆپۆڤ (رەخنەی مێژوویی لە مەسەلەی نەژادی کورددا) »[٤٨] .... هتد. مامۆستا کوردۆ لەم کۆمەڵە وتارەیدا لە سەر بنچینەیەکی زانستی رەوت و بە یارمەتی گەلێك بەڵگەی مێژوویی گرنگ رەخنە لەو بیر و را هەڵە و نادراستانە دەگرێت کە دەربارەی زمان و مێژووی

---

(٤٤) بڕوانە کتێبی « نامەی زانایانی زانکۆی لینینگراد » ، ١٩٥٤ ، ژ ١٧٩ ، ل ١٢٠ ـ ١٢٧ .

(٤٥) بڕوانە « کورتەی دەنگوباسی ئامۆزگای رۆژهەڵاتناسی » ، ١٩٥٥ ، ب ١٧ ، ل ٤٣ ـ ٦١ .

(٤٦) بڕوانە کتێبی « کورتەی وتارەکانی کۆنفرانسی زانستی ئێرانناسی » ( بۆ یادی شەستساڵەی پروفیسۆر ن. ئا. بۆلدرێف ) ، مۆسکۆ ١٩٦٩ ، ل ٢٥ ـ ٢٨ .

(٤٧) ئامادە کراوە بۆ چاپ .

(٤٨) ئامادە کراوە بۆ چاپ .

گەلی کورد کراون . وردبوونەوە لەو وتارە بەرخانەی کوردۆ کە هەندێکیان لەم کتێبەدا بڵاوکراونەتەوە رادەی دڵسۆزی و بەرزی پایەی زانستی خاوەنیان بە ئاشکرا دەخەنە بەرچاو . ئەم وتارانە لە راستیدا کەلێنێکی باشیان لە کوردناسی سۆڤیێتدا پڕکردۆتەوە .

مامۆستا کوردۆ لە هەندێك لە وتار و بەرهەمەکانیدا هەوڵی داوە ئەرکی گرنگی سەر شانی کوردناسان و رێگەی گەشە کردنی کوردناسی دیار بکا ، بە وێنە لە کۆتایی وتاری « رەخنە لە بیر و باوەڕی هەڵە بەرامبەر بە زمانی کوردی »دا نووسەر باسی گرنگی و بایەخی چەند لێکۆڵینەوەیەکی کردوە کە لە ماوەی ئەم پازدە ساڵەی دواییدا خۆی بەشی هەرە زۆریانی جێ بەجێ کردوە . ئەمەش بۆ خۆی بەڵگەیەکی گرنگی تری بە پەرۆشی مامۆستا کوردۆیە کە هەر « دەرس داناداتـ » ، بەڵکو بەر لە هەموان خۆی بە لێپرسراویش دادەنێ[٤٩] . هەر بەو هەستەوە خۆی دەهاوێتە گێژاوی لێکۆڵینەوەی زەحمەترین و کەم زانراوترین باس . هیچ دوور نەڕۆین ئەوە ماوەیەکە دەستی کردوە بە لێکۆڵینەوە لە زازا و نووسراوە ئاینێکانی کوردە یەزیدێکان کە بێگومان هەر دووکیان بایەخێکی زۆریان بۆ کوردناسی هەیە . مامۆستا کوردۆ لە چەند کۆبوونەوەیەکی زانستیدا لە بارەی ئەم مەسەلانەوە وتاری پێشکەش کردووە و تیایاندا دژی ئەو بیر و باوەڕانە وەستاوە کە زازا و

---

(٤٩) بڕوانە : لیستەی کارە زانستێکانی ق. کوردۆ ، کە لە کۆتایی ئەم پێشەکییەدا نووسراون .

یەزیدی بەکورد دانانێن و لەم بارەیەوە گەلێك بەڵگەی مێژوویی و زمانەوانی نوێ و گرنگی داوە بە دەستەوە .

وەك لە سەرەوە وتمان لەم چەند لاپەڕەیەدا توانای ئەوە نییە بە درێژی لە کارە زانستییەکانی ق. کوردۆ بدوێین، بۆیەکا هەوڵمان دا تەنها هەندێك روی گرنگی چالاکییەکانی مامۆستا کوردۆ لە مەیدانی کوردناسیدا بخەینە بەرچاو ، بۆ ئەوەی خوێندەواری کوردی خۆشەویست مامۆستای بەرێزمان وەك زاناش بناسی . هەر بۆ ئەم مەبەستەش وا لە خوارەوە لیستەی ناوی کارە زانستییەکانی مامۆستا قەناتی کوردۆ بلاو دەکەینەوە :



بەرهەمە چاپکراوەکانی :

١— ئیزافە لە زمانی کوردیدا ، گۆڤاری « شۆڕش و نوسین » ، مۆسکۆ ١٩٣٣ ، ژ ١ ، ل ٤١ — ٥٦ (بە هاوکاری ئی. ئی. تسوکەرمان و عەرەبی شەمۆ) .

٢— نێر و مێ لە زمانی کوردیدا ، کتێبی « نوسین و شۆڕش » ، مۆسکۆ — لێنینگراد — ١٩٣٣ ، ژ ١ ، ل ١٧٩ — ١٨٠ (بە هاوکاری ئی. ئی. تسوکەرمان و عەرەبی شەمۆ) .

٣— لە بارەی زمانی ئەدەبی کوردی ئەرمەنستانەوە ، رۆژنامەی « ریا تازە » ، یەریڤان ١٩٣٣ ، ژ ٣١ .

٤— چەند وشـەیەك دەربارەی فەرھەنگی ئەرمەنی ـ كوردی ، ڕۆژنامەی « ڕێیا تازە » ، یەریڤان ١٩٣٣ ، ژ ٣١ .

٥— یاسای نوسین لە زمانی كوردیدا ، ڕۆژنامەی « ڕێیا تازە » ، یەریڤان ١٩٣٣ ، ژ ٣٣ .

٦— ڕەخنە لە « ڕێزمانی زمانی كوردی » ـ خاچاتۆریان ، ڕۆژنامەی « ڕێیا تازە » ، یەریڤان ١٩٣٣ ، ژ ٣٥ ـ ٣٦ .

٧— لە بارەی پێشكەوتنی زمانی كوردییەوە ، ڕۆژنامەی «ڕێیا تازە» یەریڤان ١٩٣٤ ، ژ ٦٨ .

٨— یەكێتی سۆڤێت لە ئەدەبی كوردی دەرەوەدا ، « كورتەی وتارەكانی كۆنگرەی زانستی فیلۆلۆژی » ، ١٩٤٨ ، ل ٤٥ ـ ٤٦ .

٩— كتێبی ڕێزمانی زمانی كوردی ، ( بە زمانی كوردی ) ، یەریڤان ١٩٤٩ .

١٠— چەند بەرھەمێكی فۆلكلۆری كوردی ، « زمانە ئێرانێكان ، مۆسكۆ ـ لێنینگراد ١٩٥٠ ، ب ٢ ( بە ھاوكاری ئی. ئی. تسوكەرمان ) ، ( بە كوردی و ڕوسی ) .

١١— كوردی سۆڤێت لە ئەدەبی كوردی دەرەوەدا ، « نامەی زانایانی زانكۆی لێنینگراد » ، ١٩٥٢ ژ ١٢٨ ، ل ١٢٦ ـ ١٥٠ .

١٢— شێواندنی مێژوی كورد لە زانستی مێژوی بۆرجوازی فارسدا ،

« نامـەی زانایانی زانکۆی لێنینگراد » ، ١٩٥٤ ، ژ ١٧٩ ، ل ١٢٠ ـ ١٣٧

١٣ــ رەخنە لە بیر و باوەڕی هەڵە بەرامبـــەر زمانی کوردی ، « کورتەی دەنگوباسی ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی » ، ١٩٥٥ ، ب ٢ ، ل ٤٣ ـ ٦١ .

١٤ــ خ. ئابۆڤیان وەکو کوردناس و ئەتنۆگراف ، « هەواڵی ئەکادیمیەی زانستی ئەرمەنستانی سۆڤێت » ، ١٩٥٥ ، ژ ١٠ ، ل ٨٩ ـ ٩٨ .

١٥ــ رێنووسی زمانی کوردی ، رۆژنامەی « رێیا تازە » ، یەریڤان ١٩٥٥ ، ژ ٥٨ .

١٦ــ خ. ئابۆڤیان زانا و کوردناس ، « لە بابەت مێژووی رۆژهەڵاتناسی رووسەوە » ، مۆسکۆ ١٩٥٦ ، ب ٢ ، ل ٣٦٠ ـ ٣٨٠ .

١٧ــ وشە ژمارەییەکان لە زمانی کوردیدا ، « کورتەی دەنگوباسی ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی » ، ١٩٥٦ ، ب ٢٢ ، ل ٢٨ ـ ٣٦ .

١٨ــ رێزمانی زمانی کوردی ، ( بە زمانی کوردی ) ، یەریڤان ١٩٥٦ .

١٩ــ کورد ، « میللەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست » ، مۆسکۆ ١٩٥٧ ، ل ٢٤٢ ـ ٢٦٠ .

٢٠ــ زمانی کوردی ، « ئیزانی ئەمڕۆ » ، مۆسـکۆ ١٩٥٧ ، ل ٦٠ ـ ٧٥ .

٢١— ڕێزمانی زمانی کوردی ، ( بە زمانی ڕوسی ) ، مۆسکۆ ١٩٥٧

٢٢— دروست بونی وشە Word - building لە زمانی کـوردیدا ، « ڕێزمان و مێژوی زمانەکانی ڕۆژهەڵات » ، لێنینگراد ١٩٥٨ ، ل ١٠٩ ـ ١٤٢ .

٢٣— سەرکەوتنی کوردناسی سۆڤێت ، گـۆڤاری « کـۆمۆنیـست » ، یەریڤان ١٩٥٩ ، ژ ١٣٦ .

٢٤— دەربارەی دوَ بنچینەی دروست بونی وشە لە زمانی کوردیدا ، « کورتەی دەنگوباسـی ئامۆژگـای ڕۆژهەڵاتناسی » ، ١٩٥٩ ، ب ٢٩ .

٢٥— کارەکانی پ. لێرخ لە بارەی کوردناسـیـیەوە ، « لە بابـەت مێژوی ڕۆژهەڵاتناسی ڕوسەوە » ، مۆسـکۆ ١٩٥٩ ، ب ٤ ، ل ٣٩ ـ ٥١ .

٢٦— تەصریفی کرداری ( متعد transitive ) لە زمانی کوردیدا ، « وتاری نوێنەرانی سۆڤێت لە کۆنگرەی بیست و چوارەمی ڕۆژهەڵاتناسیدا » ، مۆسکۆ ١٩٦١ ، ل ٩ .

٢٧— لە بارەی پێشکەوتنی کوردناسی سۆڤێتەوە ، « نامـەی زانایانی ئامۆژگـای ڕۆژهەڵاتناسی » ، ١٩٦٠ ، ب ٢٥ ، ل ٥٧ ـ ٦٧ .

٢٨— مانا و فەرمانی پاشـگری ـ ك ـ ( ەکە ) لە زمانی کوردیدا ، « لێکۆڵینەوە لە مێژوی کولتوری گـەلانی ڕۆژهەڵات » ( بۆ

بیرەوەری ئی. ئا. ئۆربیلی ) ، مۆسکۆ - لێنینگراد ١٩٦٠ ، ل ٢٦١ - ٢٦٨ .

٢٩- فەرهەنگی کوردی ( دیالێکتی کرمانجی ژوورو ) - رووسی ، مۆسکۆ ١٩٦ .

٣٠- رێزمانی زمانی کوردی ، ( بە زمانی کوردی ) ، یەریڤان ١٩٦٠ .

٣١- دەربارەی رێزمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ١٩٦٠ .

٣٢- کوردناسی لە لێنینگراد ، گۆڤاری « روناهی » ، بەغدا ١٩٦١ ، ژ ٧ .

٣٣- کۆنفرانسی بیست و پێنجەمی رۆژهەلاتناسان ، گۆڤاری « روناهی » ، بەغدا ١٩٦١ ، ژ ٧ .

٣٤- ئەحمەدی خانی و بەرهەمی ئەدەبی ، گۆڤاری « روناهی » ، بەغدا ١٩٦١ ، ژ ٨ - ٩ .

٣٥- مێژووی نوسین و لە چاپدانی فەرهەنگە کوردیەکان ، گۆڤاری « روناهی » بەغدا ١٩٦١ ، ژ ٩ - ١٠ .

٣٦- پەندی پێشینانی کوردی ، « پەندی پشینان و قسەی نەستەق گەلانی رۆژهەلات » ، ١٩٦٠ ، ( بە هاوکاری م. ب. رودێنکۆ ) .

٣٧- سیڤا ئاجی - داستانی رۆمانتیکی کوردی ، « چیرۆك و گۆرانی داستانی کوردی » ، مۆسکۆ ١٩٦٢ .

٣٨ - زمانی کوردی ، مۆسکۆ ١٩٦٢ .

٣٩— قەڵای دمدم ـ داستانی قارەمانێتی کوردی ، « چیرۆك و گۆرانی داستانی کوردی » ، مۆسکۆ ١٩٦٢ .

٤٠— مەمی ئاڵشی ـ داستانی رۆمانتیکی کوردی ، « چیرۆك و گۆرانی داستانی کوردی » ، مۆسکۆ ١٩٦٢ .

٤١— پێشەکی بۆ کتێبی م. خەزنەدار « کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا » ، بەغدا ١٩٦٢ .

٤٢— رەخنە لە کتێبی ك. راکایان و حاجی جندی « گۆرانی میللی کوردی » ، رۆژنامەی « رێیا تازە » ، یەریڤان ١٩٦٣ ، ژ ٧١ .

٤٣— پێشەکی بۆ کتێبی م. ب. رودێنکۆ « مەم و زینی ئەحمەدی خانی » ، مۆسکۆ ١٩٦٣ .

٤٤— پێشگر و پاشگر لە زمانی کوردیدا ، « فیلۆلۆژیای ئێرانی » ، ١٩٦٣ .

٤٥— پێشەکی بۆ کتێبی ژ. موسیلیان « بیبلۆگرافیای کوردی » ، مۆسکۆ ١٩٦٣ .

٤٦— بیبلۆگرافیای مێژوو و فیلۆلۆژیا و ئەتنۆگرافیای کوردی ، رۆژنامەی « رێیا تازە » ، یەریڤان ١٩٦٣ ، ژ ٧٠ .

٤٧ – لە داستانی کوردییەوە ، « کۆکراوەکانی ئێرانی » ، ١٩٦٣ ( بە هاوکاری ئی. ئی. تسوکەرمان ) .

٤٨ – کورتەی نامـــەی دوکتۆری « بەراوردکردنی رێـــزمانی دیالێکتەکانی کـوردی ( کرمانجی ژوور و خـــوارو ) » ، مۆسکۆ ١٩٦٥ .

٤٩ – جێناوی لـکاو ( enclitic ) لە زمانی کوردیدا ، « نوسراوە دێرینەکان و مەسەلەی مێژوی کولتوری گەلانی رۆژهەڵات » ، لێنینگراد ١٩٦٥ ، ل ٥٦ – ٥٧ .

٥٠ – ئامانجەکانی بەشـــی کوردی ئامۆژگای روژهەڵاتناسی لە لێنینگراد ، گۆڤاری « چیـا » ، ١٩٦٧ ، ژ ٤ ؛ ١٩٦٨ ، ژ ٥ .

٥١ – کوردی ئەرمەنستـان لە ئەدەبی دەرەوەدا ، رۆژنامـــەی « رێیا تازە » ، یەریڤان ١٩٦٠ .

٥٢ – نوســـراو دەربارەی کوردناسی ، گۆڤاری « چیـا » ، ١٩٦٩ ، ژ ٧ .

٥٣ – بیر و باوەڕی ئارەمانێتی لە بەرهەمی ئەدەبی ئەحمەدی خانیدا ، گۆڤاری « چیا » ، ١٩٦٩ ، ژ ٧ .

٥٤ – شوێنی وشەی پێوەندی لە زمانی کوردیدا ، « نوســراوە دێرینەکان و مەسەلەی مێژوی کولتوری گەلانی رۆژهەلات » ،

لێنینگراد ـ مۆسکۆ ۱۹۰۹ .

٥٥— شی‌کردنەوەی بەڵگەکانی کەزنەفۆن دەربارەی کاردوخەکان ، « کورتەی وتارەکانی کۆنفرانسی زانستی ئیرانناسی » (بۆ یادی شەست ساڵەی پرۆفیسۆر ن. ئا بۆڵدرێف ) ، مۆسکو ۱۹٦۹ ، ل ۲٥ ـ ۲۸ .

٥٦— ل بابەت ڤیسکار ، زمان و ئەلفبایێ پەرتوکێت دینی ئێزیدیان ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد » ، بەغدا ۱۹۷۳ ، ب ۱ ، ل ۱۳۲ ـ ۱۷۲ .



ئەو بەرهەمانەی مامۆستا کوردۆ کە بۆ چاپ ئامادە کراون :

۱— ئی ئا. ئۆربێلی وەکو کوردناس (وتار) .

۲— بەراوردکردنی ڕێزمانی دیالێکتەکانی کوردی ( کرمانجی ژوورو و خوارو ) ، ( ئەم کتێبە نامەی دوکتۆرێکەیەتی ) .

۳— کارەکانی ئەمینی عەڤدال لە بارەی کوردناسییەوە ( وتار ) .

٤— کوردناسی ( وتار ) .

٥— لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی لە عێراق ( وتار ) .

٦— نووسراوە ئاینێکانی کوردە یەزیدێکان ( وتار ) .

۷— فەرهەنگی کوردی ( کرمانجی خوارو ) ـ روسی ( بە هاوکاری

چەنــد زانایەکی بەشی کوردی ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناسی لێنینگراد ) .

٨— دەربارەی مێژوی لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی ( کتێب — نزیکەی ١٠٠ ل ) .

٩— بەرهەمی فۆلکلۆری کوردی ( کتێب — نزیکەی ٢٥٠ ل ) .

١٠— کورد — دەربارەی مێژوی ئەتنۆگرافیای کورد ( کتێب — نزیکەی ١٩٠ ل ) .

١١— ناوی ( علم ) لە زمانی کوردیدا ( وتار — نزیکەی ٢٠ ل ) .

١٢— پڕۆژەی چارەسەرکردنی نوسینی کوردی ( وتار — ٢٢ ل ) .

١٣— پەندی پێشینان و قسەی نەستەق ( کتێب — نزیکەی ٢٠٠ ل ) .

١٤— گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی ( وتار — ١٩ ل ) .

١٥— دروست بونی وشە بە هاوکاری رەگی کردار ( وتار — ١٢ ل ) .

١٦— پێشگر و پاشگر لە زمانی کوردیدا ( وتار — ١٩ ل ) .

١٧— لە بارەی سێ فەرهەنگی کوردییەوە ( وتار — ٧ ل ) .

١٨— کوردناسی لە پێتەرسبورگ و لێنینگراد ( وتار — ٣٨ ل ) .

١٩— پڕۆژەی دانانی فەرهەنگی روسی — کوردی ( وتار — ١٢ ل ) .

٢٠— بنچینەی لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی ( وتار — ٧ ل ) .

٢١— چەند تێبینییەك لە سەر کتێبەکەی ڤیلچێڤسکی ( وتار — ١٥ ل ) .

٢٢— سەرنجێك لە نامەی دوکتۆرێکەی ئاکۆپۆڤ ( ڕەخنەی مێژوویی لە مەسەلەی نەژادی کورددا ) ( وتار — ١٨ ل ) .

ئەو کارە زانستییانەی مامۆستا کوردۆ ئێستە پێوەیان خەریکە :

١— مێژوی زازا ( وتار ) .

٢— زازا کوردن ( وتار ) .

٣— نوسراوە دێرینەکانی سلێمانی و شێوەی جیاوازیان ( وتار ) .

٤— لە بارەی چاپی ئەستەمولی « مەم و زین »ی ئەحمەدی خانییەوە ( وتار ) .

٥— شێوەی نوسینی نوسراوە ئاینیێکانی یەزیدی ( وتار ) .

٦— رەخنە لە کارە زانستێکانی ئی. ئی. تسوکەرمان ( وتار ) .

٧— بیر و باوەڕی کوردایەتی لە ئەدەبی کوردیدا ( وتار ) .

دوور نییە جگە لەو کارە زانستییانەی لە سەرەوە ناومان بردن ، ق. کوردۆ نوسراوی کەشی هەبێ ، بەڵام ئێمە هەر ئەوەندەمان ئاگا لێیە .

لە کۆتاییدا هیوامانە خامەی رەنگینی مامۆستا کوردۆ لە مەیدانی گەورەی کوردناسیدا هەر لە برەودا بێ و قوتابخانە پڕ شانازێکەی هەمیشە سەرکەوتو بێ . تاقە هیوای منیش ئەوەیە بەم کارە بچوکەم توانیبێتم چەپکە گوڵێکی وەفا پێشکەش مامۆستای خۆشەویستم و خزمەتێکی بچوکیش پێشکەش رۆشنبیری گەلەکەمان بکەم .

د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف

# شێواندنی مێژووی کورد
## لە زانستی مێژووی بۆرجوازیی فارسدا

ئەم وتارە رەخنەیەکی مێژووییە کە مامۆستا قەناتی کوردۆ لە کتێبەکەی رەشید یاسمی « مێژووی نەژاد و بەیوەستەگی کورد »[1] گرتووە و ساڵی ١٩٥٤ لە کتێبی «نامەی زانایانی زانکۆی لینینگراد»دا بڵاوی کردۆتەوە ( وەرگێڕ ) .

زانایانی بۆرجوازیی هەمیشە پیشەیان دروست کردنی تیۆری زۆرداریی و کۆنەپەرستانە و هەڵبەستنی چاو و رادی دوور لە راستی بووە . بەدرۆخستنەوەی ئەو جۆرە تیۆرییانە ـ واتە ئاشکرا کردنی

---

(١) کورتەی ئەم کتێبە لە لایەن مامۆستایان : قانعی هونەر و کەریم زەندەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردیی و لە ساڵی ١٩٦٩دا لە چاپخانەی کامەران ، لە سلێمانیی چاپکراوە . بێگومان ، ئەمە کارێکی بەکەڵك و خزمەتێکی گەورەیە کە ئەو دوو مامۆستایە کردویانە ، بەڵام بەداخەوە تووشی هەڵەیەکی گەورە بوون ، ئەویش بەوەی شوێنە باشەکانیان وەرگێڕاوە و ئەوەی خراپە لایان داوە . بەم جەشنە هەر کەسێك ئەم کتێبە بە کوردیی بخوێنێتەوە ، ئەوە رەشید یاسمیی قەڵەم فرۆشی کورد ،=

ناڕاستی و چەوتی ئەو مێژوونوسە بۆرجوازیانە - پێویستی سەر شانی ئێمەی مێژوونوسانی سۆڤیێتە و دەبێ لەسەر بنچینەی تیۆری مارکسی - لێنینی ڕاستی بخەینە پێش چاو .

ئەم کتێبە کە لەم وتارەدا ڕەخنەی لێدەگرین ، وەك نوسەر خۆی دەڵێ : لەسەر داواکردنی وەزارەتی ڕۆشنبیری ئێران نوسراوە، بەو مەبەستەی کە « ڕەگەز و یەکێتی میللەتی کورد لەگەڵ میللەتی ئێراندا ( فارسدا - ق. کوردۆ ) ، هەروەها یەکێتی مێژوویان و هاوکاری کورد لە ژیانی ئێراندا نیشان بدرێ » ( ل ٢١٩ )[٢] .

نوسەر بۆ بەجێهێنانی ئەو داوایە لە مەسەلەی نەژاد و مێژووی کورد کۆڵیوەتەوە هەر لە دەورەکانی کۆنەوە - واتە لە پێش دەوری سەفەویەکانەوە تا ئەمڕۆ . بۆ مەبەستی شێواندن و وەرچەرخاندنی مێژوو و ڕەگەزی کورد ، ئەم کتێبە هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی بە فڕ و فێڵ هۆنراوەتەوە و بەمەدا دەردەکەوێ کە نوسینی ئەم کتێبە بۆ

---

= کە مێژووی کوردی شێواندووە بە کوردێکی دڵسۆز دێتە بەرچاو ......
دەبینین ئەو نوسینانەی مامۆستا کوردۆ لە کتێبەکەی یاسمیەوە هێناویێتیەوە ( کە یاسمی دەیەوێ بە زۆر کورد بە فارس بکات ) لە چاپی کوردیدا بەرزێنراوە . بە ڕای من وا باشتر بوو ، کە ئەم کتێبە چۆنە هەر بەو جەشنە وەربگێڕدرێتە سەر زمانی کوردی ( وەرگێڕ ) .

(٢) ئەم کتێبەی ڕەشید یاسمی لە ساڵی ١٩٤٣دا ، لە لایەن ( ن. کەڵباکۆف ) ەوە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی ڕوسی . مامۆستا ق کوردۆش لە لێکۆڵینەوەکەیدا سوودی لەم تەرجومەیە وەرگرتووە ( وەرگێڕ ) .

پێویستیەکی سیاسی حکومەتی ئێران بووە .

بۆ مەسەلەی رەگەز و مێژوی کورد، لە دەورەکانی هەرە کۆنەوە تا سەدەی ١٦ ز. نوسەر گەلێك بەڵگە و بیر و باوەڕی لە زمان و مێژوو و کولتور و نەژادی کوردەوە لە سەرچاوەکانی رۆژهەلات و ئەوروپاوە هێناوەتەوە . بۆ مێژوناس و کوردناس ئەم بەشانەی کتێبەکە زۆر بەکەڵك و گرنگن و دەتوانرێ بوترێ ئەوەی لە کتێبەکەی ردشید یسمیدا باش و سوودبەخش بێت تەنها ئەم بەشانەن .

ناوەرۆکی کتێبەکە بەم جۆرەیە : پاش پێشەکی (ل ١ - ٣) و سەرەتایەك لە مێژوی کورد (ل ٣ - ١٤ ) نوسەر کوردستان لە کۆنا نیشان دەدات (ل ١٥ - ٤٤ ) . لە پاشانا دێتە سەر تەماشا کردنی پەیوەندی میللەتەکانی هیند و ئەوروپایی لەگەڵ ئاشوری و عیلامیدا (ل ٤٤ - ٦٦ ) ؛ باسی مێژوی کیمیریان و ساکائیان دەکات (ل ٦٧ - ٦٩ ) ؛ پادشایەتی ماد و فارس (ل ٧٠ - ٧٤ ) ؛ هەندێك بەڵگە دەربارەی وڵاتی پارسوا (ل ٧٤ - ٧٧ ) ؛ بەهێز بونی پارسوا (ل ٧٧ - ٧٨ ) ؛ بە کورتی باسی مێژوی پادشایەتی کۆرش (٧٨ - ٨٣ ) ؛ دوا پادشای بابل (ل ٨٣ - ٨٥ ) ؛ کیری مەزن (ل ٨٦ - ٨٧ ) .

پاش ئەوەی بە دوور و درێژی و بە گشتی باسی مێژوی کوردستان لە کۆنا و باسی ئەو میللەتانەی لە کوردستان ژیاون دەکا ، ئنجا بە تایبەتی لە مێژوی کورد دواوە . نوسەر دەربارەی مانای وشەی «کورد» (ل ٨٨) و رەگەزی کورد (ل ٨٩ - ٩٩ ) گەلێك بیر و رای زانایان نیشان دەدا . سەبارەت بە نەژادی کورد گەلێك داستان و

ئەفسانەی عەرەبی و فارسی و کوردتی دەهێنێتەوە ( ل ١٠٠ ـ ١١٨ ) . لە ( ل ١١٩ ـ ١٢١ )دا باسی ئاین و باوەڕی کورد ، وە لە(ل ١٣٢ ـ ١٣٨ )دا باسی زمانی کوردتی و پەیدابوونی دەکات . بەشێکی تایبەتی لە کتێبەکەی بۆ لێکۆڵینەوە و ڕوونکردنەوەی تیۆری جیاواز لە بارەی میللەت و نەتەوەوە تەرخان کراوە ( ل ١٣٩ ـ ١٤٥ ) . دوو فەسڵی کۆتایی دەربارەی مێژووی کوردە ؛ لە باسی مێژووی کورد لە پێش ئیسلامدا گەلێك بەڵگە و نموونەی لە سەرچاوە یۆنانییەکانەوە هێناوەتەوە ؛ بە دوور و درێژی باسەکانی گەزنەفۆن دەربارەی خەباتی کورد لە دژی لەشکری یونان نیشان داوە ( ل ١٤٦ ـ ١٥٨ ) ؛ هەروەها لە باسەکانی پۆلیبیا ( ل ١٥٩ ـ ١٦٠ ) و سترابۆن ( ل ١٦٠ ـ ١٦٥ ) دواوە . ئەم فەسڵە بە باسێك دەربارەی نەژادی ساسانیەکان ( ل ١٦٥ ـ ١٧٤ ) کۆتایی پێهێنراوە .

دوا فەسڵی ئەم کتێبە دەربارەی مێژووی کوردە پاش ئیسلام ( ل ١٧٥ ـ ١٨٢ ) . لێرەدا بە کورتی لە بنەماڵە و ئەمارەتەکانی کورد : هەمەدان ، مەریوان ، شەدادی ، ئەیوبی .... دواوە . لە پاشا نووسەر دێتە سەر باسی مێژووی خەباتی کورد و ئەمیرەکانی دژی عەرەب ( ل ١٨٢ ـ ١٨٨ ) و ئوغوز ( ١٨٨ ـ ١٩١ ) و سەلجوقی ( ل ١٩١ ـ ١٩٢ ) و مەغۆل ( ل ١٩٢ ـ ١٩٩ ) و تەیمور ( ١٩٩ ـ ٢٠٣ ) . دوا بەشی ئەم فەسڵە لە بابەت مێژووی کوردەوەیە لە دەوری سەفەویەکاندا ( ل ٢٠٣ ـ ٢٠٩ ) . کتێبەکە بە کۆتاییەك و ناوی ئەو سەرچاوانەی ، کە بۆ نووسینی ئەم کتێبە سوودی لێ بینراوە تەواو دەبێ ( ل ٢٠٩ ـ ٢٤٦ ) .

دێینە سەر لێکۆڵینەوە لە بیر و باوەڕەکانی نوسەر :

لە بەشی « سەرەتایەك لە مێژوی کورد »دا نوسەر رەخنە لەو تیۆرییانەی کە رەگەزی کورد بە فارس دادەنێن دەگرێ . بێ هیچ بەڵگەیەك و بێ هیچ بنچینەیەکی زانستی هەوڵی داوە بۆ لەناوبردن و تەفر و توناکردنی ئەو تیۆرییەی کە دەڵێ : کورد میللەتێکی رەسەن و جیاواز و خاوەن کولتور و زمان و مێژوی تایبەتی خۆیەتی ...
نوسەر زۆر بە ئاشکرا دەیەوێ شۆڤێنێتی فارسی بسەپێنێ بەسەر کورددا . یاسمی نوسیویتی دەڵێ : پێویستە لە کورد و مێژوی کورد تەنها لە رێگای پەیوەندییەوە لەگەڵ میللەتی ئێراندا ( فارسدا ـ ق. کوردۆ ) بکۆڵرێتەوە ، چونکە « کورد بە رەگەز و نەژاد ئێرانین » و « لە نەژاد و زمان و باوەڕی ئاینییاندا هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ میللەتە ئێرانیێکانی تردا نەبووە ( ل ١٤٤ ) .

لە رەخنەگرتنی ، لەو زانایانەی ، کە لەسەر مێژوی کورد نوسیویانە رەشید یاسمی دەڵێ : « لەگەڵ ئەوەی کورد ئێرانییە ، کەچی لە زۆر کتێبدا بەرچاوم کەوتووە ، کە وەك ئەدیب بێ هیچ بەڵگەیەك نەژادی کورد بە ئێرانی نازمێرن ، بەڵکو کورد بە هۆزەکانی تورك و سامی دادەنێن » ( ل ١٤٤ ) .

رەشید یاسمی لە رێگای چەسپاندنی سیاسەتی شۆڤێنێتی حکومەتی شاوە گەیشتۆتە ئەو رادەیە ، کە ئەو زانایانەی رەگەزی کورد بە ئێرانی ( واتە فارس ـ ق کوردۆ ) دانانێن ناو دەنێ دوژمنانی گەلی کورد . نوسەر دەڵێ : ئەوان ( ئەو زانایانە ـ وەرگێڕ )

له رێگای مەبەستێکەوە « کورد لەو شوێنەی رەگ و ریشەی تیدا دروست بووە جیـــا دەکەنەوە و واش دەدەنە قەڵەم ، کە کورد لە عەرەبەوە یا لە خالدی و میللەتانی کەوە پەیـــدا بوون » ( ل ٦ ) . هەروەها دوا میللەت کە ناوی هێنرا ( واتە خالدی ـ وەرگێڕ ) نوسەر ناوی ناوە « زۆردار » و « چەتەکانی جیهانـ » یاخود « هۆزەکانی بێ‌لانەی ناو بیابان » ( ل ٧ ) .

زۆر بە شێوەیەکی ساکار وەڵامی ئەو تیۆری‌یانە دەداتەوە ، کە رەگەزی کورد بە ئێرانی دادەنێن . ئەو دەڵێ : « کورد یەکێکە لە لقەکانی هەرە کۆنی ئەو میللەتانەی رەگەزیان ئێرانییە ( فارســـە ـ وەرگێڕ ) و ئەوان ( کورد ـ وەرگێڕ ) لقێکی بۆ بـەری درەختی ئێرانی بوون » ( ل ٧ ) .



لەو فەصـڵەدا کە دەربارەی مێژووی ئەو میللەتانەیە ، کە زۆ لە کوردستان ، لە ساڵانی ٣٠٠٠ ی پ . زاینەوە دەژیان ( ل ٢٠ ـ ٤٣ ) بە دوور و درێژی باسی : لولوبی ، کاسی ، گوتی .... دەکات ، کە لە ناوچە شاخاوییەکانی زاگرۆسدا دەژیان . لێرەدا بە کورتی باسـی مێژووی شەڕ و شۆڕی ئـــەو میللەتانە لەگەڵ بابلی و ئاشوریـیەکاندا دەکات ، هەروەها هەندێك نموونەی لە بیر و باوەڕی زانایان سەبارەت بە رەگەز و زمانیان هێناوەتەوە .

هەندێ لە زانایان نیشانیان داوە کە ئـەو نەتەوانە ( لولوبی ، کاسی ، گوتی ـ وەرگێڕ ) بە رەگەز لە میللەتەکانی هیند و ئەورووپایی نین . چەند مێژووناس و زانای تر هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕەی ، کە

ئەو میللەتانەی ناومان هێنان سەرچاوەی کوردی ئێستان : ( لۆز ) لە ( لولو )وە ، ( کاسکان ) لە ( کاسی )یەوە ، ( کورتی ) لە ( گوتی )یەوە . بەم جۆرە زانایان هاتونەتە ســەر ئەو ئەنجامەی کە کورد لە فارس کۆنترە و هەر لەبەر ئەوەشە ، کورد بە رەگەزێکی ئێرانی ناژمێرن . رەشید یاسمی لە پێناوی ئەوەی نیشانی بدا کە کورد هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ میللەتانی کۆنی نەئێرانیدا نییە زۆر بە توندی دژی ئەو باوەڕە وەستاوە ، کە دەڵێ مێژۆی کورد تەنها بە فارسەوە بەستراوە و بەر لە پەیدابونی فارس لە زەوی کوردستانی ئێستا و ئێراندا هیچ کوردێك لە جیاکانی زاگرۆسدا نەبووە .

هەروەها بەم بۆنەیەوە رەشـید یاسمی نوسیوێتی دەڵێ : ئەو زانایانە بە هەڵە « کورد بە نەوەی ئەو میللەتانە دەژمێرن کە زۆ ـ واتە لە پێش مادەکاندا ـ لە ناوچەکانی کوردستانی ئێستادا دەژیان ، وەك : گوتی ، لولو ، کاسی ... هتد . ئەو زانایانە هەڵەن کە کورد بە رەگەزی ئێرانی ناژمێرن » (ل ١٢) . « هیچ بەڵگەیەك نییە بۆ ئەوەی هۆزێکی کوردی ئەمڕۆ بە نەوەی میللەتانی دوێنێ : لولو ، گوتی ، کاسی ، خالدی بداتە قەڵەم » ( ل ١٢ ) نوسەر لە هەمو شوێنێکدا لە زاراوی ( ئێرانی ) وا تێدەگا کە مانای زاراوەی ( فارسی )یە .

رەشـید یاسمی وا دەدوێ کە گوایا وشـەی کورد بۆ مانای کۆمەڵێکی ئەتنۆگرافی بە هیچ جۆرێك لە ناو ئەو میللەتانەی زوی کوردستاندا کە ناوبران نابینرێن . بەم بۆنەیەوە نوسـیوێتی دەڵێ : « لەو نوسراوە کۆنانەی کە سەبارەت بە کوردستانی کۆن هەن و کە ئێمە بە راستیان دەزانین و باوەڕیان پێدەکەین ، نەمانتوانی ئەو هۆزە

کۆردانەی ناوابران بدۆزینەوە تەنها لەسەر بەردێکی سۆمەریی وشەی (کاردا) بەرچاو کەوتووە و ئەمەش ناوی ناوچەیەکە ، نەك ناوی هۆزێکی تایبەتی کە بەسترابێ بە کورد و ماد و فارسەوە » (ل ٨٨) .

ئەم دوانەی ڕەشید یاسمی تا بڵێی چەوت و ناڕاستە . ئەم چەوتییەش بە ئاشکرایی لەو نموونە و بەڵگانەی نووسەر لە گەڵێك سەرچاوەوە هیناونییەوە دەردەکەوێ . هەروەها لە هەندێ دوکومێنتی جیاوازی میللەتانی کۆنی ڕۆژهەڵات و ئاسیای ناوەڕاستدا وشەی (کورد) بۆ مانای کۆمەڵێکی ئەتنۆگرافی لەو هۆزانەی لە ناوچەکانی زاگرۆس دەژیان بەکار هێنراوە . جگە لەوە ڕەشید یاسمی خۆی وشەی (کاردو ، کوردی ، کارادا ، کورد)ی هێناوەتەوە ، کە گوایا لە نووسراوە کۆنەکانی (بابل و سۆمەر ... هتد)دا ، وەك ناوی میللەتێك ، کە لە چیاکانی زاگرۆس ژیاون باسیان کراوە . بەڵام نووسەر وەك هەندێ زانا ، ئەو وشانەی ناومان بردن بە ناوی ئەتنۆگرافی دانانێت ، بەڵکو بە ناوی جوگرافی ناوچەکانی دادەنێ . بەم بۆنەیەوە دەڵێ : « هەندێ لە زانایان بێ بەڵگە ئەم ناوانە بە وشەی (کورد)ەوە دەبەستن ، بەڵام نە وشەی (کاردو) ، نە (کارادا) ، نە (کورتی) ، نە (خالدی) هیچ پەیوەندییەکیان بە وشەی کوردەوە نییە » (ل ٩٤) .

ڕەشید یاسمی وا نیشانی دەدات ، کە لەگەڵ ناوی ئەم ناوچانە : (کاراد) ، (کاردو) ، (کورتی) ، (کورد)دا ، هەروەها ناوی

هۆزێکی ( ئێرانی )ش -( بە تێگەیشتنی رەشید یاسمی فارسی ) هەبوو ، کە ناوی کورد بێ .

نوسەر چ بەڵگەیەکی هەیە بۆ ئەوەی بڵێ : لە زۆدا لە نیوان « ئێرانیەکاندا » - واتە فارسەکاندا هۆزێکی فارسی هەبێ ، کە ناوی کورد بێ ؟

بەڵگەی تەنها ئەوەیە کە نمونەی لە ستراپۆنەوە هێناوەتەوە و دەڵێ : « هۆزەکانی کورد ، وەك ماردام لە ولاتی فارس دەژین و بەو مرۆڤە بەتواناناینەی ولاتی فارس دەڵێن کارداك . مرۆڤانی کارداك لە ڕێگای جەردەیەتییەوە دەژین . وشەی کارداك مانای مرۆڤی ئازا و بەتوانایە » ( ل ۱۰۷ )

رەشید یاسمی لەسەر ئەساسی ئەو وشە ناڕاشکرایانەی ستراپۆن ، هاتۆتە سەر ئەو رایەی کە کورد لە پارسەوە ( فارسی ئەمڕۆوە ) پەیدابووە . رەشید یاسمی نوسیویێتی : « پارسوا لانك و مەڵبەندی کوردە » ( ل ۱۰۷ ) .... بڵاوبونەوەی کورد بە بزوتنەوەی هۆزەکانی هیند و ئێرانییەوە بەستراوە . لە نیوان ئەو هۆزانەدا هۆزی فارس هەبون . ئەم هۆزانە بە زۆری هێز لە ڕێگای دەربەندی قەفقاسەوە لە باکورەوە هاتنە ئاسیای بچوك . لە سەرەتادا لە خۆرئاوای دەریاچەی ورمێدا جێنشین بون و لە پاشانا بەرەو باشور بۆ ناوچەی پارسوا - ئێستای فارس - کەوتنەرێ .... « و هۆزەکانی ئێستای رەگەزی ئێرانیان لێ دروست بێ » ( ل ۳ ) . « کورد - هۆزێکی ئێرانییە و لە ناوچەیەکدا کە زۆ ناوی ( کورد ) بووە جێگای ژیانی

بۆ خۆی دۆزیبیەوە ، هەروەها دانیشتوانی کۆنی ئەم ناوچەیەی دەکرد و مەحو کردەوە . ئیتر لەو دەمەوە ئەم هۆزە ( هۆزە فارسە ) ( کورد ـ وەرگێڕ ) ناوی نوێی لێنرا ـ واتە بە ناوی ئەو ناوچەیەوە کە داگیریان کرد » ( ل ٩٩ ) . بەم چەشنە ، دەبینین بۆ بەڵگە ، رەشید یاسمی دەیەوێ دەربخات کە رەگەزی کورد فارسە .

بە باوەڕی ئێمە کورد لە فارسەوە نەکەوتۆتەوە ، بەڵکو لە ئەنجامی تێکەڵاو بوونی چەند هۆز و میللەتانی کۆن ، کە لە چیاکانی زاگرۆس جێگیر بووبوون پەیدابووە . گەلێك لە هۆزەکانی کورد ، کە خاوەنی ئایین و باوەڕی جیاوازن ، یاخود جیاوازی لە ئەتنۆگرافیایاندا هەیە . هەروەها مانەوەی گەلێك ناوی هۆزی کۆن لە ناو کۆمەڵی کورددا و هەندێ ناوی جوگرافیی ناوچە شاخاوییەکانی ئاسیای بچووك ، کە بوون بە ناوی هەندێ لە هۆزەکانی کورد وای دەردەخەن کە میللەتی کورد لە ئەنجامی تێکەڵ بوونی هەندێك هۆز و میللەتان ، کە لە ناوچە شاخاوێکانی زاگرۆس دەژیان ، یاخود هاتبوون بۆ ئەم ناوچەیە پەیدابووە . لێرەدا بۆ نموونە چەند ناوێکی ئەو هۆزانە دەخەینە پێش چاو : ( کاسکان ـ لە ناوی کۆنی میللەتی کاسییەوە هاتووە ، کە لە چیاکانی زاگرۆس دەژیان ) ؛ ( لولو ـ لە ناوی میللەتی لولووە هاتووە ، کە لە خوارووی چیاکانی زاگرۆس دەژیان ) ؛ ( کورت ـ لە ناوی میللەتی کورتەوە هاتووە ، کە لە سەرووی رۆژهەڵاتی چیاکانی زاگرۆس دەژیان ) ؛ ( خالتان ـ لە ناوی میللەتی کۆنی خالدییەوە ) ؛ ( داسنی ـ لە ناوی میللەتی تاسانییەوە هاتووە ، هەروەها لەگەڵ

ناوی زۆی ناوچەی تاســاتی وێکدەچن ) ؛ ( تاکاری ـ لە ناوی کۆنی ناوچــەی تیـکوریەوە هاتووە ، کە ئەم ناوچەیە کەوتۆتە خواروی ئەرمەنســتان ) ؛ ( زیلان ـ لە ناوی زۆی زیلونیەوە هاتووە ، کە کەوتۆتە خواروی ئەرمەنستان ) .

بێ گومانــ ، وێکچوونی ناوی هۆزەکانی کورد لەگەڵ ناوی میللەتانی کۆن و ناوچەکانی کوردستانی زۆردا بە ڕێکەوت نییــە ، بەڵـکو ئەمە نیشانی مێژوی پێکهاتن و دروست بونی میللەتی کورد دەدات . ئەم بەڵـگانە ، بەر لە هەمو شتێك نیشانی ئەوە دەدەن ، کە لە دروست کردنی میللەتی کورددا ، میللەتانی کۆنی زا گرۆس و ئێران ( ماد ، پارفیــان ، فارس ) ، ســامی و هۆزەکانی خواروی قەفقاس و میللەتی ئەرمەن .... هتد گەورەترین هاوبەشییان کردوە . لە کاتی دروست بوندا گروپی زمانە ئێرانیـکان ( نەك تەنها فارس ) بەســەر گروپی زمانەکانی تردا ســەرکەوتووە و لە ئەنجامی ئــەم سەرکەوتنەدا زمانی کوردی دروست بووە و بە گوێرەی یاســای موتوربە یەکێکە لە زمانە ئێرانیێکان .

زمانی هەندێك لە هۆزەکانی زۆی زا گرۆس ، کە لە بنچینـەی دروست کردنی میللەتی کورددا هاوبەشییان کردوە ، لە خێزانی زمانە ئێرانیـکان بون . لەم ڕوەوە زمانی کوردی ، وەك یەکێك لــە زمانەکانی ئەســڵی زاگرۆس خزمایــەتی و پەیوەندی لەگەڵ زمانەکانی میدی و پارفیاتی و فارسیدا هەبووە ، بەڵام بە هیچ جۆرێك لە زمانی فارسییەوە دروست نەبووە و نەکەوتۆتەوە ، وەك ڕەشید یاسمی

وا بۆ شەرم دەیەوێ بیسەلمێنێ . بۆشك هاوبەشی کردنی ماد و پارفیان و فارس لە دروست بوونی میللەتی کورددا بووە بە هۆی بەهێز کردنی پەیوەندێ لەگەڵ زمانە ئێرانیەکاندا ( میدێ ، پارفیانێ ، فارسێ ) ، بەڵام ئەمە بە هیچ جۆرێك نابێت بە بەڵگە بۆ نیشاندانی ئەوەی ، کە کورد لە فارسەوە پەیدابوبێ و زمانی کوردێ لقێك بێت لە زمانی فارسێ .

وشەی کورد ، وەك ناوی میللەتێك ، کە لە سنووری چوارچێوەی کوردستاندا ژیاوە ، لە نووسراوەکانی یۆنان و ئەرمەن و سۆمەر .... هتددا بەرچاو دەکەوێ . بە پێی ئەو سەرچاوانە ، کورد زۆر لە کۆنەوە لە ناوچەکانی ناوەڕاستێ کوردستانی ئێستادا ژیاوە ـ واتە ( لە باشورەوە هەر لە دەریاچەی وان و ورمێوە تا چیای زاگرۆس ، لە خۆرهەڵاتەوە لە رووباری دیجلەوە ؛ لە خۆرئاوەوە لە بۆتانسۆوە .

لە نووسراوەکانی سۆمەر و ئاشوردا ( ٢٠٠٠ ـ ١٠٠٠ ) پ. ز. ناوی هۆزی ( کورتیس ) یا ( کورتی ) کە لە خواروی رۆژهەڵاتی ناوچەکانی زاگرۆسدا ژیاوە بەرچاو دەکەوێ . لە نووسراوەکانی ( نارامسین )دا ، دەور و بەری ( ٢٥٠٠ ) پ ز. ناوی هۆزی لولوبی ( لولو ) ، کورتی ، کە لە ناوچە شاخاویەکانی زاگرۆس ژیاون دەبینرێ . لولوبی ( لولو ) لە زانستدا بە ئەسڵی ( لوڕ ) ناسراوە ؛ هۆزی ( کورتی ) شێوەیەکی ناوی ( کورتی )یە ، کە لە هەندێ نووسراودا بەرچاو دەکەوێ . بەشێك لە زانایان لەسەر ئەو باوەڕەن ،

کە لولوبی ( لولو ) ، گورتی ( گورتی ) لە بارەی زمانەوە لە سەرەتادا لە میللەتەکانی قەفقاس بون ، وە بەشێکی تریان زمانی کۆنی ئەم هۆزانە بە زمانێکی هیند و ئەوروپایی دادەنێن .

بەبەڵگەکانی رۆمانی دەوری ســالانی ٢٢٠ ـ ١٧١ پ. ز. لەشکری کورتی (کورد) لە جەنگدا دژی رۆم هاوبەشییان کردوە.

بە پێی بەڵگەکانی ئەخیمیند لە نیوان ئەو میللەتانەی دژی دارا جەنگاون ناوی میللەتی (ساگارتی یا ساکارتی یا زیکورتی) ، کە لە نزیك ئەربیلەوە ژیاون بەرچاو دەکەون . هەندێك سەرچاوە نیشــانی دەدەن ، کە لە کاتی هێرشی ئەسکەندەری مەکدونیدا ( ناوەڕاستی سەدەی ٤ی پ. ز.) بۆ رۆژهەلات ، کاردوخەکان ( کوردەکان ) بەشێك بون لە لەشکری دارای پادشــای فارس . کەزنەفۆن کە سەرۆکی لەشکرێکی دە هەزار سەربازی بو (ساڵی ٤٠١ پ ز.) دەڵێ : سوپاکەم بە ولاتی کاردوخ ( کورد )دا تێپەڕی . دانیشتوانی ئەو وڵاتە ئازایەتیەکی زۆر گەورەیان لە شەڕدا نیشاندا . کەزنەفۆن کاتێك دێتە سەر باسی ئەو رێگایانەی خۆی و لەشکرەکەی پیایاندا تێپەڕیون ، نووسیۆیتی دەڵێ :لە بابلەوە رێگایەکی شاخاوی بەرەو باکور دەکشێ ، کە بۆ وڵاتی کاردوخ دەچێ. ئــەم هۆزە لەسەر چیاکان دەژین . کاردوخەکان جەنگاوەرن و سـەر بۆ هیچ پادشایەکی فارس شۆڕ ناکەن[٣] .

---

(٣) کەزنەفۆن ، ئەنەباسیس ، مەکسیمۆڤا وەریگێڕاوەتە سەر زمانی رۆسی ، مۆسکۆ ـ لێنینگراد ١٩٥١ ، ل ٩٣ .

به پێی وشـەکانی گزنەفۆن : ناوچە شاخاوییەکەی کاردوخ کەوتبوە خوارۆی روباری ( کینتریت )ەوە و ئەم روبارە بۆتۆ بـە سنوریێك لە نێوان ولاتی ئەرمەن و کاردوخدا[4].

زانایانی جوگرافی یۆنانی سەدەکانی سەرەتای زایین (سترابۆن ، پتولەمی ... هتد) دەڵێن : ناوەڕاسـتی کوردستانی ئێستا ناوی کاردوئینە ( کاردوینە ) بو . لەبەر رەوشنایی نوسراوەکەی سـترابۆن وا دەردەکەوێ ، ( کاردۆئینە ) ـ ئەو ولاتە شاخاوییەیە ، کە کەوتۆتە نیوان موش و دیاربەکری ئێستاوە .

لە لای مێژوناسانی ئەرمەنی سەدەکانی سـەرەتای زایـین و سەدەکانی ناوەڕاست ، ناوی ( کوردس ئەشخار ) ـ ( ولاتی کورد ) و ( کوردیك ـ ناوچە شاخاوییـکانی کوردستان ) بەرچاو دەکەوێ .

بـەم جۆرە وشەی ( کوردس ) لە زۆر کۆنا مانای ( کورد ) بووە ، واتە ـ کۆمەڵێك هۆزی ئەتنۆگرافی بوون ، کە لە ناوەڕاستی کوردستانی ئێستادا دەژیان[5].

رەشید یاسمی هەوڵی داوە ئـەو بەڵـگە مێژوییانەی دەربارەی کورد و ولاتی کورد هەن بشارێتەوە ، جگە لە شاردنەوەی ئـەم بەڵـگانە هێشتا ویستویەتی نیشانی بدا و بیچەسپێنێ کە وا کورد لە

(٤) هەمان سەرچاوە ، ل ١٠٢ .

(٥) لێرەدا لە وشـەی (کوردستان ) مەبەسـتمان ( ناوچەکانی چیـای زاگرۆسە ) ـ واتە ئەو ناوچانەی کەوتونەتە سنوری تورکیا و ئێران و عێراقەوە ، کە دانیشتوانیان کوردن .

فارسەوە پەیدابوون و کەوتوونەتەوە و وڵاتی فارس لانك و مەڵبەندی پەیدابوونی کوردە .

ئەم هەوڵدانەی نوسەر بە ئاشکرایی لە کاتی لێکۆڵینەوەیدا لەو سەرچاوە عەرەبیانەی کە دەربارەی رەگەزی کورد دەدوێن دەردەکەوێت . لە سەرێکەوە ، بە رایەکی راست زۆر بە توندی رەخنەی گرتووە و دژی باوەڕی هەندێ مێژوونوسی عەرەبی سەدەکانی ناوەڕاست کە رەگەزی کوردیان بە عەرەب داناوە ، راستاوە . کەچی لە سەرێکی کەوە بە تەواوی باوەڕی بەو سەرگوزشتە و داستان و ئەفسانانەی عەرەب هێناوە کە بۆ بەرژەوەندی فارس رەگەزی کورد بە فارس دادەنێن . دەبینین زۆر داستان و سەرگوزشتەی هۆزەکانی کورد و مێژوناسانی عەرەب ، کە رەگەزی کورد بە عەرەب دادەنێن رەشید یاسمی بە دروست کراو و هەڵبەستراویان دەداتە قەڵەم و لە ریزی « چیرۆکە خەیاڵییەکان و مێژونوسە سەر لێشێواوەکان » دایان دەنێ ( ل ١٠٩ ) . بەڵام ئەفسانەکانی فارس و هەندێ سەرگوزشتەی هۆزەکانی کورد ، کە رەگەزی کورد بە فارس دادەنێن ، نوسەر بە راستیان دادەنێ و بە واقعی تەواویان دەداتە قەلەم . لەم بارەیەوە نوسیویەتی : « زوربەی ئەم سەرگوزشتە و ئەفسانانە بنچینەیەکی مێژوویی واقعییان هەیە » ( ل ١١٨ ) .

رەشید یاسمی ئەو سەرگوزشتە کوردیانە و ئەو لێکۆڵینەوانەی مێژوونوسانی عەرەب ، وەك : مەسعودی ، تەبەری .... هتد ، کە رەگەزی کورد بە عەرەب دادەنێن ، بە سەرچاوەیەکی بێ کەڵك و

بێسوود دەژمێرێ و بەم بۆنەیەوە نوسیویەتی : « لە کاتێکدا کە عەرەب داگیرکەر بوون ، کورد بۆ خۆ دوورخستنەوە و رزگار بوون لە جەردەیەتی داگیرکەران ، نەژادی خۆی شاردۆتەوە و لە تاوا وایان نیشان داوە کە لقێکن لە عەرەب . هەر ئەمەشە کە بووە بە هۆی سەر لێشێواندنی هەندێ لە مێژوونوسانی عەرەب ، کە رەگەزی کوردیان بە عەرەب داناوە » ( ل ١١٠ ) . لە شوێنێکی تردا رەشید یاسمی دەڵێ : « تەبەری و هەندێ مێژوونوسی تری پێش ئەو نەیان ویستوە ددان بەوەدا بنێن ، کە ئەم هۆزە نەترسە سەری شۆڕ نەکردوە و ژێردەستی قبوڵ نەکردوە و لە دەوری ئەواندا گەلێك ئاژاوەی ناوەتەوە و ئەم هۆزە بە رەگەز ئێرانین » ( ل ١١٨ ) .

ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی ئەتنۆگرافی و جوگرافی ، کە زانایان دەربارەی کورد گەیشتونیەتێ ، تووشی بەر بە نازامەت و ناتەواوی دادەنێ . ناتەواوییەکەش بەوە دادەنێ ، کە کۆمەڵێك لە زانایان کورد بە میللەتێك لە میللەتانی قەفقاس دەژمێرن ؛ کۆمەڵی دووەم لە زانایان ( سولاك ، ریچ ، لوشان ) کورد لەگەڵ هۆزەکانی سەروی قەفقاس باس دەکەن ؛ کۆمەڵی سێیەم لە زانایان ( ئیڤانۆفسکی ، شانتر ، پیتتارد ) کورد بە ئێرانی دەدەنە قەڵەم . بەڵام بە باوەڕی یاسمی کورد هیچ شتێکی تایبەتی خۆی نییە ، کە ببێت بە هۆ بۆ بوون بە میللەتێکی جیاواز و رەسەن .

رەشید یاسمی بە هەموو جۆرێك دژی ئەو باوەڕەیە ، کە کورد بە میللەتێکی قەفقاسی ، یا سەروی ئەوروپا دابنرێ . بەم بۆنەیەوە

دەڵێ : « باوەڕی ریج و سولاك و لوشان بەوەی کە دەڵێن وێکچوون لە نێوان کورد و هۆزەکانی سەرەوی ئەوروپادا هەیە ، بە هیچ جۆرێك راست نییە و بۆ چەسپاندن و سالماندنی ئەو رایە هیچ کاتێك ، ئێمە پاشماوەی ئەوەمان لەم ناوچەیەدا نەدیوە ، کە لە هەج دەمێکدا هۆزەکانی سەرەوی ئەوروپا لێرەدا جێگیربوبن » ( ل ١٠٦ ) .
ئۆسەر رەخنە لەو زانایانە دەگرێت ، کە کورد بە خاوەن رەگەزی سەربەخۆ دادەنێن و دەڵێ : « هەندێ لە زانایان لەوەدا راست نین ، کە کوردیان بە میللەتێکی خاوەن رەگەزێکی سەربەخۆ داناوە و بە میللەتێکی جیاواز و رەسەن ژماردووە . ئەوان (ئەو زانایانە - وەرگێڕ) بە شوێن ئەو شتانەدا گەڕاون کە کورد لەگەڵ میللەتە گەورەکاندا جیا دەکەنەوە ، بەڵام ئەوان نەیانتوانیوە شتی جیاواز ، یا تایبەتی (بۆ کورد - وەرگێڕ ) بدۆزنەوە . بەم جۆرە هەر زانایەك شتێکی رێکەوتی دۆزیوەتەوە کە لەگەڵ واقعدا ناکونجێ و ئەمە ناتەواوییەکەیانە . بەڵام ، گەر ئەوان کورد بە میللەتێکی جیاواز و رەسەن دانەنێن و کورد چۆنە بەو جۆرە بیدەنە قەڵەم - واتە داینێن ، کە هۆزی کورد بە رەگەز ئێرانییە ( بە تێگەیشتنی رەشید یاسەمی فارسە - ق. کوردۆ ) ، ئەوسا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانیان بە تەواوی لەگەڵ واقع و زانیاریدا دەگونجێ » ( ل ١٠٦ ) .

شۆڤێنیێتی ئێرانی و زۆر لێکردن و فێزکردنی رەشید یاسەمی بەو رادەیە و بەو شێوەیەیە کە دەڵێ : گەر کورد بە میللەتێکی جیاواز و رەسەن دانەنین ، بەڵکو بە هۆزێکی بە رەگەز ئێرانی ( فارسی ) داینێین ، ئەوسا بە ئاسانی دەتوانرێ لە مەسەلەی مێژوی

کورد و کولتور و زمانی بکوژرێنەوە . رەشید یاسمی باش دەست بە وشە بێ ماناکانی خۆی دەکات ، کە کورد بە فارس دادەنێ . وشەکانی یاسمی هەر وەك ئەو وشە بێ مانایانەن کە کورد بە ئێرانی دادەنێن و ئەو دژبان دەدوێ . ئاشکرایە ، تا ئێستا هیچ بەڵگەیەکی زانستی نییە کورد بکات بە فارس . جا لەبەر ئەودیە ئـــەو هـەوڵ دەدات بیچەسپێنێ و بەڵگە بدۆزێتەوە . بۆ بەجێهێنانی ئەو مەبەستەش لە مەســـەلەی نزیکی زمانی فارسی و کوردی ، یەکێتی ئایین و باوەڕ و کۆمەڵایەتی ، چارەنوسی مێژوویی و هاوکاری لـە مێژووی ئێراندا کۆڵیوەتەوە . ئەم باسانە بە لای ئەوەوە گرنگن ، چونکە ئەو ئەم مەسەلانە بە خاسیەتی گەورەی نەتەوە دادەنێت . ئەو دەیەوێ نیشانی بدات ، چۆن لەو خاسیەتانەدا کە ناوبران ، کورد هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ فارســـدا نییــە ـ واتە « هەردوکیان نەتەوەی ئێرانیان پێکهێناوە » ( ل ١٤٠ ) .

یەکەم ـ بۆ هەموان ئاشکرایە ، کە هیچ نەتەوەیەکی ئێرانی نییــە ، بەڵکو میللەتانی ئێران یاخود نەتەوەکانی ئێران ( فارس ، کورد ، ئەفغان ، تاجیك .. هتد ) هەن . خۆ دەزانین ، کە نەتەوەی سلاڤی نییە ، بەڵکو نەتەوەکانی سـلاڤی یاخود میللەتەکانی سـلاڤی ( رۆس ، بولگار ، چیك .... هتد ) هەن ، کە هـــەر یەك لەم میللەتانە خاوەنی مێژوو و کولتور و زمانی .... خۆیانن . هەر بـــەم چەشـنەش : هـــەر یەك لە میللەتەکانی ئێران خاوەنی مێژوو و کولتور و زمانی تایبەتی خۆیانن . ئاشکرایە ، رەشید یاسمی لەبـەر بەرژەوەندی شۆڤینیێتی فارسی ، هەموو ئەم میللەتانە بە فارس دادەنێ .

هەر لەبەر ئەوەشـــە کە زۆر جار « نەتەوەی فارس » ، « مێژوی فارس » ، « ئەدەبی فارســـی » ، « زمانی فارسی » ... هتد دەکا بە « نەتـەوەی ئێران » ، « مێژوی ئێران » ، « ئـــەدەبی ئێرانی » ، « زمانی ئێرانی » .

رەشید یاسمی زمانی کوردی ، باوەر و ئاینی کورد ، مێژو و کولتوری کورد ، وەك شـــێوەیەك یاخود لقێك لە زمانی فارسی ، مێژو و کولتوری فارس تەماشا دەکا .

رەشید یاسمی دەربارەی زمانی کوردی نوسیویەتی : « زمان مەرجێکی سەرەکییە بۆ بون بە نەتەوە و ئەمە باشتر لە هەمو شتێك نیشانی یەکێتی کورد و میللەتی ئێران دەدات » (ل ١٢٢ ) .... « لە بەراوردکردنی وشەکانی فارسی و کوردی ، زۆر ئاسان ئەم یەکێتییە دەردەکەوێ » (ل ١٣٢ ) . ئەگەر کورد و فارس خاوەنی یەك زمانیش بن ، هێشتا ئەمە نابێت بە بەڵگە ، تا بوترێ کە هەردوکیان ( کورد و فارس ـ وەرگێڕ ) یەك نەتەوە پێـــكدەهێنن . ئەوەندە بەسە ، گەر پەنجە بۆ نەرویج و دانیمارك رابکێشین ، کە خاوەنی یەك زمانن ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەك نەتەوە نین .

بۆ نیشاندانی یەکێتی زمانی کوردی و فارسی ، رەشید یاسمی حەڤدە وشـــەی هێناوەتەوە[٦] ، کە گوایا لە هـــەردو زمانەکەدا

(٦) هێنانەوەی حەڤدە وشەی وێکچو لە زمانی کوردی و فارســیدا ، بە هیچ جۆرێك نابێت بە بەڵـگە بۆ ئەوەی بوترێ ، کورد لە فارسەوە پەیدابوە . جا ، خۆ هەزاران وشـەش هەن کە لەیەك ناچن ، گەر=

وێکدەچن. نوسەر لەو وشانە لە ڕوی (فۆنێتیك و مۆرفۆلۆژی و سینتکسیس ...)ەوە نەکۆڵیوەتەوە و تەنها دەڵێ ئەم وشانە، وەك وشەکانی فارسی وان. بەڵام، گەر ڕەشید یاسمی لەم ڕووەوە بەراستی بکەوتایەتە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی، ئەوە زۆر سەربەخۆیی و جیاوازی زمانی کوردی بۆ ئاشکرا دەبو. بێشك ئەو ناتوانێ ددان بەم ڕاستیەدا بنێ، چونکە، گەر ڕاستی بڵێ، ئەوسا ئەو مەرامەی هەیەتی بۆی نایەتە دی. جا هەر لەبەر ئەودشە بیر و باوەڕی هەندێ زانا (مان، زالیمان، ئەندیاس، میبا، لینتس) بەراست دەزانێ، کە دەڵێن: هەرچەندە جیاوازی لە نیوان زمانی کوردی و زمانی ئێرانیدا هەیە؛ بەڵام هەر یەك زمانن و ئەو زمانەش فارسییە. ئەو جیاوازییەی لە نیوان زمانی کوردی و فارسیدا هەیە، شتێکی گرنگ نییە، بەڵکو ڕێکەوتە و هەروەها زمانی کوردی لقێکە لە درەختی زمانی فارسی» (١٣٤).



لێرەدا بە ئاشکرایی دیارە، کە ئەو ئەنجامەی زانایانی ناوبراو ـ کە زمانی کوردی و فارسی بە یەك زمان دادەنێن ـ گەیشتونیەتێ شتێکی هەڵە و چەوتە، هەر بەم جۆرەش ڕاست نییە بوترێ، زمانی ڕوسی و پۆڵەندی یەك زمانن. وێکچونی بەشێك لە وشەکانی هەندێك زمان، وا ناگەیەنێ کە ئەو میللەتانە یەك ڕەگەزن.

هەرچەندە لە زمانی کوردی و فارسیدا گەلێك وشە هەن

---

= وابێ، دەبێ ئەمەش بێ بە بەڵگە بۆ دوری زمانی کوردی و فارسی. ئەم جۆرە نمونانە بنچینەیەکی زانستییان نییە (وەرگێڕ)

وێکدەچن ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانرێ بوترێ ، زمانی کوردی لە زمانی فارسییەوە پەیدا بووە . زمانی کوردی چ لە فۆنێتیک ، چ لە مۆرفۆلۆژی ، چ لە سینتکسیس ، چ لە دروست بوونی وشەدا زمانێکی سەربەخۆیە و ئەم راستیە لە مێژە لە لایەن کوردناسانی سۆڤێتەوە نیشان دراوە و چەسپێنراوە .

لە تەماشا کردنی جیاوازی لە نێوان زمانی کوردی و فارسیدا ، رەشید یاسمی وای دەداتە قەڵەم ، گوایا ئەمە ئەو جیاوازییەیە کە لە نێوان دیالێکتەکانی زمانی ئێرانی ( بە تێگەیشتنی رەشید یاسمی فارسی )دا هەیە . نووسەر زمانی کوردی ناوناوە زمانی گفتوگۆی کورد ، وە زمانی فارسیش بە زمانی ئەدەبی دادەنێ . ئەو وای داوەتە قەڵەم ، کە ئەدەبی فارسی بۆ کورد هێندە خۆشەویست و نزیکە ، کە وا کورد ئارەزوو دەکەن هەر بە زمانی فارسی بخوێنن و بنووسن ( ل ١٣٤ ـ ١٥٥ ) رەشید یاسمی دەڵێ : « تا ئەم ساڵانەی دوایی لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا ، جگە لە نووسینی فارسی هیچ نووسینێکی تریان بەکار نەدەهێنا » ( ل ١٣٥ ) . « مێژوونووسان و زانایانی کورد بە زمانی فارسی نووسیویانە » ( « شەرەفنامە » و ... هتد ) . دەربارەی ئەو شاعیر و نووسەر و مێژوونووسانەی بە زمانی کوردی نووسیویانە[7] ، رەشید یاسمی بێدەنگ بووە . کەچی لەگەڵ

(٧) بڕوانە : ئەدەبیاتی کوردی ؛ ئینسکلۆپیدیای ئەدەبی ؛ وتارەکەی ڤیلچێڤسکی ، ئەدەبی کوردی دەرەوە ، « زمانە ئێرانییەکان » ، ب ٤ ، لینینگراد ١٩٤٥ ؛ گۆڤاری « دەنگی گێتی تازە » ، بەغدا ١٩٤١ ـ ١٩٤٦ ؛ هەروەها وتارەکەی من ، ئەدەبی کوردی دەرەوە دەربارەی =

ئەوەشدا چەند جارێك باسی کتێبە ئاینییەکانی هۆزەکانی کورد (یەزیدی ، شەبەك .... هتد) دەکات ، کە پاشماوەی ئاینی رۆژهەلاتی کۆنیان پاراستوە . وەك زانایان[8] دەڵێن ، ئەم کتێبانە بە کوردی نەنوسراون ، بەڵکو بە فارسی نوسراون .

رەشید یاسمی بەرامبەر بە کوردی ئێستای عێراق ، کە خاوەنی نوسین و زمانی ئەدەبی خۆیانن بێدەنگ بووە و لەگەڵ ئەوەشدا ، چەند جارێك دەڵێت : هەرچەندە زمانی کوردی لە ساڵی (۱۹۲۱)ەوە بووە بە زمانی دووەمی رەسمی حکومەتی عێراق . بەلام کوردەکان خوێندنیان هەر لە رێگای کتێبە فارسییەکانەوەیە . رەشید یاسمی نوسیویەتی : « لەعێراقدا ، لە ساڵی (۱۹۲۱)ەوە لە قوتابخانە میرێکان و دەزگا رەسمیەکاندا بە زمانی کوردی کەوتنە نوسین ، بەلام لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا هەر کتێبە فارسییەکان دەخوێنن ، وەك : دیوانی سەعدی و نیزامی .. . هتد » .

بەم بۆنەیەوە هەندێك بەڵگە دەهێنینەوە بیر رەشید یاسمی ، کە بۆ رەگەز پەرستی بە بۆگەنەکەی ئەو ناخۆشە . ئاشکرایە ، زمانی گفتوگۆی دەوڵەتی سەفەوی فارسی نەبو ، بەڵکو ئازربایجانی

= کوردی سۆڤیت ، کتێبی « مێژو و فیلۆلۆژی ولاتانی رۆژهەلات » ، ۱۹۵۲ ، ژ ۳ .

(۸) ئو . فیلچێفسکی ، مێژوی یەزیدیەکان ، گۆڤاری « ئاتایست » ، ژ ۱ ، مۆسکۆ ۱۹۳٦ .

بوو . هەروەها دامەزرێنەری دەوڵەتی سەفەوی ـ شائیسماعیل بە زمانی ئازربایجانی لە پاش خۆی دیوانێکی گەورەی شیعری بەجێهێشت . بەڵام رەشید یاسمی خۆی لەم بەڵگەیە دەرخستۆتەوە و کەڕکردوە ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کە دێتە سەر باسی دەوڵەتی سەفەوی بە دەوڵەتێکی ئێرانی ( بە تێگەیشتنی ئەو فارسی ) دادەنێ . ئێمە شکمان لەوە نییە کە زمانی فارسی و نووسینی فارسی لە ناو دەربەگەکانی کورددا زۆر بڵاوبۆتەوە . هەروەها دەشزانین ، هەندێ لەو دەرەبەگانە کە رەشید یاسمی بەناوی ئەوانەوە دەدوێت ، ئامادەن واز لە زمانی زگماکی خۆیان بهێنن و میللەتی کورد بکەن بە قوربانی لە رێگای سیاسەتی حکومەتی شادا . بەڵام رەشید یاسمی هیچ مافی ئەوەی نییە بەناوی تێکڕایی میللەتی کوردەوە بدوێت .

مێژووی میللەتی کورد بە تێکڕایی شایەتە ، کە کورد خاوەنی کولتوور و زمانی خۆیەتی . خەباتی میللەتی کورد لە رێگای ئازادی و سەربەخۆییدا زنجیرێکی خوێناوییە ، کە بە هەموو سەدەکانی مێژووی میللەتی کورددا تێپەڕیوە . بەتایبەتی لەم دەمەدا خەباتی میللەتی کورد ئاشکرایە و وا بزانین تەنها بیرخستنەوەی خەباتی میللەتی کورد لە ساڵانی شەڕی دووەمی جیهاندا ، کە چۆن لە کوردستانی ئێراندا حکومەتێکی ئۆتۆنۆمییان پێکهێنا و چۆن بە زەبری بێبەزەییانەی حکومەتی زۆرداری شا لەناوبرا ، بەڵگەیەکی ئاشکرا و راست و باوەڕپێکراوە .

رەشید یاسمی هەتا بە رەگوشتی ئاینیش کورد بە لقێکی فارس

دادەنی و بەم بۆنەیەوە تۆسیوێتی دەڵێ : « ئایین یەکێکە لە مەرجەکانی نەتەوە ... » ( ل ١١٩ ) .... « لەسەر بنچینەی پاشماوەی ئاینی ، ئێمە دەتوانین ئەوە بیچەسپێنین ، کە چۆن هۆزی کورد لقێکی درەختی ئێرانییە و هەروەها ئەوەش ئاشکرایە ، کە چۆن هەزار ساڵ لەمەوبەر هەمو ئێران و کوردستان ئاینی ئیسلامیان وەرگرتووە . لێرەدا یەکێتی تەواویان دەردەکەوێ . جگە لەوە ، بەر لە ئیسلام ئاینی دانیشتوانی کوردستان لەسەر ئاینی ئێرانی بو ( واتە زەردەشتی ـ ق. کوردۆ ) .

ئاشکرایە ، کە بەڵگە و لێکۆڵینەوەکانی رەشید یاسمی راست نین و لە راستییەوە زۆر دورن . دیارە کە بە هیچ جۆرێك ناتوانرێت ئاین بە بنچینەیەك بۆ یەکێتی نەتەوەیەك بژمێررێت . هەموتمان باش دەزانین کە تورك و عەرەب و فارس و ئەفغان و میللەتانی تر زۆر لەمێژە ئاینی ئیسلامیان وەرگرتووە ، بەڵام بە هیچ چەشنێك ناتوانرێ بوترێ ئەمانە یەك نەتەوەن . ئەگەر لە رێگای ئاینەوە تەماشای کورد بکرێ ، کە لە چ نەتەوەیەکە ، ئەوسا بە ئاسانی دەتوانرێ کورد بکرێ بە عەرەب ، بە تورك ، بە ئەفغان . .. هتد .

هەروەها لە بیر رەشید یاسمی دەخەینەوە ، کە ئەم میللەتانەش هەر ئیسلامن . رەشید یاسمی دەڵێ : « ئیمڕۆ بە گشتی کورد لەسەر ئاینی ئیسلامن . زوربەی کورد شافعین و تا لە ئێرانیش زوربەی هۆزەکانی کورد هەر شافعین ، جگە لە هۆزەکانی ئەردەڵان و هەندێ لە هۆزەکانی کرماشا و لوڕستان نەبێ کە جەعفەرین » ( ل ١٢٢ ) .

بەم چەند دێڕەی نوسەردا وا دەردەکەوێ ، تەنها چەند هۆزێکی کورد جەعفەرین ، کە یاسا ئاینیەکانی حکومەتی ئێران لەسەر ئەم ڕێگایەن و ئێستاش بووە بە ئاینی نەتەوەی فارس . زوربەی هۆزەکانی کورد سونین ـ واتە شافعی ین . بەم چەشنە ، لە ڕێگای ئاینەوە ئاشکرا بێ ، کە کورد بە هیچ جۆریك لقێك نییە لە درەختی فارسێ .

ڕەشید یاسمی دەڵێ : پێش ئیسلام باوەڕی ئاینێ کوردستان لە سەرەتایەکی ئێرانێ ( فارسی ـ ق کوردۆ )یەوە پەیدا بێ بێ . ئێمە نازانین کە ئاینی زەردەشتێ لەناو دانیشتوانی کۆنی کورددا چۆن بڵاوبێبێوە ، بەڵام ئەوەی ئاشکرا بێت ، تەنها ئەوەیە ، کە پەرەستنی ئاگر لای هەندێك لە هۆزەکانی کورد هەبووە . ئەگەر لەمەدا ئەوە بەدی بکرێ کە باووباپیری کورد لەسەر ئاینی زەردەشتێ بێن ، ئەوە هیچ زانایەکی ڕاست ئەوە ناکات بە بەڵگە ، کە یەکێتێ ئاین نیشانی یەکێتێ میللەت بدات .

هەر بەم جۆرەش دەربارەی بەڵگە ئەتنۆگرافیێکان ، نوسەر دەڵی : لەم ڕوەوشەوە هیچ جیاوازییەك لە نیوان کورد و فارسدا نییە « ڕەوشتی پرسەکردن و بێك هێنان و هەڵپەرکێ و سێرانە و ڕەوشتەکانی تری کورد ، هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ هەمان ڕەوشتانی ئێرانیێکاندا ( فارسەکاندا ـ وەرگێڕ ) نییە » .

ئاشکرایە ، ئەم ڕەوشتانە لای عەرەب و فارس و تورك و کورد یەك جۆرن . هۆی وێکچێنی هەندێك لەم ڕەوشتانە لای ئەو

میللەتانەی ناومان بردن ، ئەنجامی هاوژینییەکی درێژ و هاوئایینی و پەیوەندی کولتورییە لە نیوانیاندا . هەروەها ئاشکرایە ، کە هاوئایینی نابێ بە بەڵگە و بە هۆ بۆ ئەوەی بوترێ ئـەم میللەتانە لە یەك رەگەزن .

هیچ بەڵگەیەك لـەو بەڵگانەی رەشـید یاسمی دەربارەی نیشاندانی ئەوەی کە رەگەزی کورد فارسە هێناونیـەوە ، بە بەڵگە نازمێررێن و هەروەها بەڵگەکانی لەسەر بنچینەیەکی زانستی نین . رەشـید یاسمی خۆشـی باش تێدەگات کە هیچ بەڵگەیەك لەو بەڵگانەی بۆ کورد کردن بە فارس هێناونیەوە لە راستییەوە نزیك نین و باوەڕیان پێناکرێت ، بەڵام بەلای ئەوەوە ئەمە گرنگ نییە ، بەڵکو گرنگ ئەوەیە ، بە هەج جۆرێك بێت کورد بکات بە نەتەوەی ئێرانی ( فارسی - ق. کوردۆ ) . لەم بارەیەوە ئەو نوسیویێتی : « با بڵێین هیچ بەڵگەیەك لەو بەڵگانەی هێناومانەتەوە نەیان سەلماندووە و نەیان چەسپاندووە ، کە رەگەزی کورد ئێرانییە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، هـەر دەبێ کورد بە کۆمەڵی نەتەوەی ئێرانی دابنرێت » ( ل ١٤٠ ) .

رەشید یاسمی دەیەوێت نەك تەنها کوردی ئێران ، بەڵکو هەموو میللەتی کورد بخاتە ژێر دەست کۆمەڵی « نەتەوەی ئێرانەوە » . دیارە رەشید یاسمی بە کەمی دەزانێ کە بەڕێوەبەرانی حکومەتی ئێرانی کۆنەپەرست تەنها ئـەو کوردانە ئەچەوسێننەوە ، کە لە کوردستانی ئێران دەژین . هیوای ئەو ئەوەیـە ، تێکڕایی میللەتی کورد بخەنە

ژێر دەستی خۆیان و بە ئارەزوی خۆیان بیانچەوسێننەوە . هەر لەبەر ئەو هۆیەشە سەرنجی بەرێوەبەرانی حکومەتی ئێرانی کۆنەپەرست رادەکێشێ بۆ داگیر کردنی کوردستانی تورکیا و عێراق ، کە ئەو هەر لە دەوری ئەخەمینیەکانەوە بە زەوی فارسی دادەنێ . وشەکانی (مۆنتسکیۆ و جانیا) دەربارەی داگیر کردن بە شێوەیەکی فراوانتر و کراوەتر دەنوسی و دەڵێ : « ئەوەی شتێکی سەیر بێت ئەوەیە ، میللەتێك کە خاوەنی یەك زمانە دابەش دەکەن بەسەر چەند میللەتێکدا . زمان ، باوەڕی ئاینی ، خو و رەوشت دەتوانن ببن بە هۆ بۆ دانانی سنور . حوکمی سیاسی و ئەو یاسایانەی بۆ جیاکردنەوەی یەك میللەت دانراون راست نین[9] . ئەگەر میللەتێکی خاوەن یەك زمان بە زۆری زۆرداری دابەش کرابێ ، رۆژێك هەر دێت کە ئەو میللەتە یەك بگرێتەوە و ئەو سنورە دەستکردە بکوژێنێتەوە » (ل ١٣٩) . ئەمەیە نەخشەی کێشراوی بۆرجوازی فارسی رەشید یاسمی .

رەشید یاسمی پەڵگەی ئەو زانایانە ، دەربارەی ئەوەی وتویانە : « کورد لە زوەدا سەربەخۆ بون ، خاوەنی دەوڵەتی سەربەخۆ و پادشا و حکومەتی ئۆتۆنۆمی خۆیان بون » (ل ٩) بە راست نازانێ و بە لاواز دادەنێ .

رەشید یاسمی لە بارەی لێکۆڵینەوەی مێژوی کوردەوە نوسیوێتی

---

(٩) لێرەدا رەشید یاسمی مەبەستی ئەوەیە ، کە میللەتی فارسیان دابەش کردوە ، چونکە ئەو کورد بە بەشێك لە فارس دادەنێ ( وەرگێڕ ) .

دەڵێ : « لە واقعدا مێژووی کورد پێویستە بکۆڵرێتەوە نەك لەو ڕێگایەوە ، کە کورد خاوەنی کام حکومەت بوون ، یاخود لە چی ناوچەیەکی کوردستاندا باجیان نەداوە . بەڵکو پێویستە لە مێژووی کورد بکۆڵرێتەوە لە ڕێگای نیشاندانی ئەو پەیوەندییانەی هەیانبووە لە ڕەگەزدا لەگەڵ ئێراندا و هاوبەشی لە مێژووی میللەتی ئێراندا بە گشتی » ( ل ٩ ) .

کاری شۆڤینیێتی فارسی وای لە ڕەشید یاسەمی کردوە ، کە بە چاوێکی سووك و بێ نرخ تەماشای گەلێك لەو سەرچاوە و کتێبانە بکات ، کە بەڵگەن بۆ نیشاندانی ئەوەی کورد خاوەنی مێژووی خۆی و دەولەتانی سەربەخۆی خۆی بووە . ئەم بەڵگانە بە دوور و درێژی لە لایەن هەندێ زانای کوردەوە نوسراون ، وەك : شەرەف خانی بتلیسی ، کە دەربارەی مێژووی کورد لە دەوری داگیرکردنی عەرەبەوە تا کوتایی سەدەی ١٦ ز. دواوە ؛ ئەمین زەکی بەگ ، خاوەنی دوو بەرگە لە کتێبی مێژووی کورد لە دەورەکانی کۆنەوە تا سەرەتای سەدەی بیست ؛ حسەین حوزنی موکریانی ، نوسەری مێژووی ئەمارەتەکانی کوردە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ؛ عەبدولعەزیز یامولکی ، باسی مێژووی شۆڕشەکانی کوردی کردوە .... هتد .

ئەو مێژوو نوسانەی لەسەرەوە ناومان بردن ، بە دوور و درێژی ، لە ڕێگای خستنە پێشچاو و هێنانەوەی گەلێك ڕوداو و بەڵگەوە ڕوونیان کردۆتەوە و نیشانیان داوە ، کە نەك جیاوازی و سەربەخۆیی هەبووە لە بوونی هەندێك ئەمارەتی کوردیدا ، لە کاتی

جیاوازدا ، بەڵکو گەلێـــك زانیاریشیان دەربارەی خەباتی میللەتی کورد لە رێگای ئازادی و ســەربەخۆیدا نوسیوە . کەچی رەشید یاسمی بەرامبـەر ئەو رووداوانە خۆی بێدەنگ کردوە ، بەڵام ئــەو ناتوانێ بە بێدەنگی بەلای ئەو بەڵگانەدا تێپەڕێ ، کە لە زانـتدا دەربارەی بونی هەندێك لە دەوڵەتانی کوردی ناسراون . هەر لەبەر ئەوەشە ددانی بە بونی چەند دەوڵەتێك و ئەمارەتێکی دەرەبەگایەتی کوردیدا ناوە . بۆیە کاتێك لـە مێژوی کورد بەر لە ئیســلام دەکۆڵێتەوە ، باسی مێژوی هەندێك لە دەوڵەتەکانی کورد دەکات ، وەك : بەرازی (ســالانی ٣٤٠_٤٠٦ ك. / ٩٥١_١٠١٥ ز.) ؛ شەدادی (سالانی ٣٤٠_٥٩٥ ك. / ٩٥١_١١٩٩ ز.) ؛ حەمدانی (سالانی ٢٨١_٢٩٣ ك / ٨٩٤_٩٠٥ ز.) ؛ مەروانی (سـالانی ٣٨٠_٤٨٩ ك. / ٩٩٠_١٠٩٥ ز.) .... بەڵام ، لەگەڵ ئەوەشدا رەشید یاسمی بە هیچ جۆرێك ناوی ئەو ئەمارەتە کوردیيانە ناهێنێ کە لە پێش سەفەویـکاندا هەبون .

کاتێك رەشید یاسمی باسی دەوڵەت و ئەمارەتەکانی کورد دەکات ، چووە مێژوی شێواندوە و باســەکەی ورەچەرخاندوە و بە مێژوی فارسی داناوە . هەروەها رووداوە مێژوییەکانی کوردســتان ، وەك رووداوی مێژویی فارس داوەتە قەڵەم . ئــەو هــەر وەك یەکێکی سەرکردایەتی فارس مێژوی کوردی وەرگێڕاوە . خەبات و هاوکاری هۆزەکان و هەندێك لە ئەمارەتەکانی کورد لە رێگای ئازادی و سەربەخۆییدا دژی داگیرکەرانی یۆنان و عەرەب و مەغوڵ و ســەلجوقی ... هتد داوەتە قەڵەم بەوەی کورد « هەستیان بە

پەیوەندیی هەمیشەییی کردوە لەگەڵ ئێرانییەکاندا (فارسەکاندا ـ ق. کوردۆ) و لەبەر ئەوە لە ڕێگای پاراستنی ئێراندا جەنگاون» (ل ۹).

نوسەری مێژوی کورد، تەنها بۆ ئەو مەبەستەی لە ڕێگایەکی چەوت و دوور لە زانستەوە نیشان بدرێ، کە کورد و فارس یەك ڕەگەزن و کورد هاوبەشی کردوە لە مێژوی فارسدا سەرناگرێ. ڕەشید یاسمی لە ڕێگای ئەم مەبەستەدا گەلێك ڕوداوی مێژویی، کە بەڵگەن بۆ نیشاندانی خەباتی کورد لە ڕێگای سەربەخۆیی و ئازادیدا بە ئارەزوی خۆی شێواندونی و هەڵیگێڕاونەتەوە. ئەو دەڵێ: «کورد هاوکارییەکی چالاکی بوە لە پاراستنی هەمو حکومەتەکانی ئێراندا لە سەرکەوتنیدا بەسەر نەینەوا و یۆناندا، لە پاراستنی ولات لە گەزنەفۆن، لە هێرشی عەرەب و لە هەزاران شەڕی کەدا دژی دوژمنان. کورد لە ڕۆژەکانی لە شکری پاراستنی ئێراندا بون، لە ڕێگای پاراستنی خاکیان ئەجەنگان و لە ڕێگای تاج و تەخت و خاکیان خۆیان دەکرد بە قوربانی» (ل ۹).

بە باسەکەی ڕەشید یاسمیدا وا دەردەکەوێ کە کورد هاوکارییەکی چالاکیان کردوە لە خەباتا لە ڕێگای سەربەخۆیی حکومەتەکانی ئێراندا. نوسەر بەمە گرنگیی زۆر دەدات. بێشك، ئەمە نیشانی ئەوە دەدات، چۆن چاکەی میللەتی کورد هەیە بەسەر مێژوی ئێرانەوە، بەڵام نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە مێژوی کورد تەنها ئەمە نییە. ئایا مێژوی کورد تەنها بریتییە لەوەی، کە خۆیان کردوە بە قوربانی لە ڕێگای پاراستنی تاج و تەختی ئێراندا؟

راستە ، بۆ نیشاندانی یەکێتی خەبات لە نیوان کورد و فارسدا دژی داگیرکەران بەڵگە هەن . بێگومان ئەم یەکێتی خەباتە شتێکی راست و پێویستە ، بەڵام هۆی ئەمە چی بووە ؟ .... رەشید یاسمی دەڵێ ، هۆی ئەمە ئەوە بووە ، کە میللەتی کورد و فارس خاوەنی « یەك ئامانج و یەك هەست بون » ، خاوەنی یەك رەگەز و یەك باوەڕی ئاینی بون » .

بە رای ئێمە یەکێتی خەباتی کورد و فارس لە هەچ کاتێکی مێژوەدا بوبێ ، دژی هـەر داگیر کەرێك بوبێ ، ئەوەیـە کە بەرژەوەندی میللەتی کورد و فارسی تیدا بووە لە رێگای پاراستنی خاکیاندا دژی ئەو داگیرکەرەی بۆ هەردوَ لا یەك دوژمن بووە ، کە ویستوبەتی سەربەخۆییان زەوت بکات .... ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە کورد و فارس بە درێژایی مێژوویان پێکەوە دژی دوژمنان جەنگاون ؟ ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم میللەتانە بەجیا خەباتیان نەکردوێ و بەجیا دژی دوژمنەکانیان نەجەنگاون ؟ ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە کورد و فارس هیچ کاتێك لەگەڵ یەکتردا شەڕیان نەکردبێ و بەگژ یەکا نەهاتبن ؟

مێژوَ نیشانی داوە ، کە کورد خەباتیان تەنها دژی یۆنان و عەرەب و مەغۆل و سەلجوقیەکان نەکردوە ، بەڵکو هەروەها خەباتیان دژی فارس کردوە . خەباتی درێژ و سەختی میللەتی کورد دژی شاکانی فارس بە دوَر و درێژی لەو کتێبانەی لەسەرەوە ناومان بردن باس کراوە . هەروەها مێژوَ شایەتی دەدات کە سەرۆکە کوردە

دەرەبەگەکان و ئەمیرەکانی کورد لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە دەرەبەگایەتی ئاسیای بچوك و سەروی میسۆپۆتامیادا دەورێکی گەورەیان بینیوە ، بەڵام رەشید یاسمی ئەمەی شاردۆتەوە . راستە ، مەجبور بووە ددان بەوەدا بنێ کە کورد لە مێژوویدا گەلێك جار هەڵمەت و هێرشیان بردۆتە سەر ئێران و شۆڕشیان دژی دەوڵەتی ئێران بەرپا کردوە . « ئەم میللەتە ( کورد — ق . کوردۆ ) کە لەم ناوچەیەدا دەژی لە ماوەی سەد ساڵدا سزای رۆژگار و چارەنوسی مێژووی زور بینی . زۆر جار روی داوە ، کە ئێران — واتە لانك و مەڵبەندی دروست بونی کورد — بووە بە مەیدانی جەنگ و کوشتار ، یاخود بووە بە شوێنی ناکۆکی و گێرەشێوێنی ناوخۆ . لەم دەورانەدا پێشرەوەکانی کورد گوێیان بە ئاینی خۆیان داوە و سەریان بۆ حکومەت شۆڕ نەکردوە و شورشیان بەرپا کردوە . بەڵام ئەوان ( کورد ) هیچ کاتێك نەیانویستوە و هەوڵی ئەوەیان نەداوە ، کە بە نیازی جیابونەوە دژی میللەتی خۆیان ( فارس — ق . کوردۆ ) شۆڕش هەڵگیرسێنن » ( ل ٧ ) .

رەشید یاسمی ئەو چەند دێڕەی بۆ نمونە هێناوەتەوە — واتە بۆ نیشاندانی ئەوەی کە کورد « سەریان بۆ حکومەت شۆر نەکردوە » و شۆڕشیان دژی ئێران بەرپا کردوە . رەشید یاسمی بە شێوەیەکی هەڵگێڕاوە باسی شۆڕشەکانی کورد دەکات ، کە دژی ئێران بەرپایان کردوە و هەروەها نایەوێ ددانی پیادا بنێ کە ئەم خەباتەی میللەتی کورد لە رێگای سەربەخۆیی و ئازادیدا شتێکی مێژوویی و مافێکی نەتەوایەتیە .

رەشید یاسمی لە باسی خەباتی میللەتی کورددا دژی دوژمنەکانی لە رێگای ئازادی و سەربەخۆییدا هەڵگێرانەوەیەکی زۆری کردوە هەندیك لەو وەرچەرخاندن و شێواندنەی رەشید یاسمی دەخەینە پێش‌چاو :

لە « ئەنەباسیس »ی کەزنەفۆندا نوسراوە : لە دەوری ئەخەمینیەکاندا ، کاردوخەکان (کوردەکان) سەریان بۆ شای فارس شۆڕ نەکردوە و لە ژێر حوکمی فارسدا نەبون . کەچی رەشید یاسمی نوسیویەتی : « ئەمە ، ئەوە ناگەیەنێ کە کورد هۆزێکی سەربەخۆ بوبێ . دەوڵەتی ئەخەمینی توانای ئەوەی هەبوە سەر بە میللەتان شۆڕ بکا و بخاتە ژێر حوکمی خۆیەوە . هەر لە سەندەوە تا بۆسفۆر و هەر لە صەیداوە تا حەبەشە لە ژێر حوکمی ئەم دەوڵەتەدا بوە و هیچ کاتێك رێگای ئەوەی نەداوە لە ناوەڕاستی حکومەتەکەیدا هۆزێکی سەربەخۆ ببێت » (ل ١٠٨) .

ئەگەر ددان بەوەشدا بنێین ، کە لە کاتی دەوڵەتی ئەخەمینیەکاندا کورد لەسەر شێوەیەکی سیاسی سەربەخۆ نەبون و لە ژێر حوکمی پادشاکانی ئەخەمینیدا بون ، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو دەمە کورد خاوەنی بنچینەی ئابوری و زمان و ژیانی کوردەواری خۆیان نەبون .

سەبارەت بەو کوردانەی دەربەندی چیاکانیان پاراستوە و دژی لەشکری کەزنەفۆن جەنگاون ، رەشید یاسمی دەڵێ : کوردەکان ئەمەیان بۆ پاراستنی خاکیان ، مالاتیان ، خۆیان و سەربەخۆییان لە بێگانە نەکردوە ، بەڵکو ئەوەیە کە « کوردەکان لە رێگای

بەجێهێنانی فەرمانی شـــا ئەردەشێردا خۆیان داوە بە کوشت و دەربەندەکانیان پاراستوە » .

دیسان ، نوسەر خەباتی کورد دژی سەلجوقیـەکان ، وەك خەبات لە رێـگای خاك و میللەتـــدا ناداتە قەڵەم ، بەڵـکو دەڵێت ئەمە خەبات بووە « دژی داگیرکەرانی تاجی ئێران » . هەروەها ، رەشید یاسمی خەباتی میللەتی کورد دژی مەغۆل و ســـەلجوق و عەرەب و داگیرکەرانی تر ، وەك خەبات لە رێـگای پاراسـتن و هێشتنەوەی « تاجی ئێراندا » تەماشـــا دەکا . رەشید یاسمی بێ ئەوەی تۆزێ شەرم بکا دەڵێ : « هەر لە دەوری سەفەویـەکانەوە لە مێژوی کورددا هیـچ شتێـکی نوێ نییە » و « ئەوەی کە هەیە تەنها دوبارە کردنەوەی رووداوەکانی کۆنە » ..... « مێژوی کورد پاش دەوری ســەفەویـەکان بریتییە لە مێژوویەکی پەیوەندی هەمیشـەیی لەگەڵ ئێراندا ، مێژویان خۆکردنە بە قوربانی لە رێـگای پاراستنی ئێرانـــدا و لە پێنـاوی هێشتنەوەی تاج و تەختی ئێراندا » ( ل ٢١٩ ) .

بەم جۆرە لە نمونەکانی ئەم کتێبەی رەشـید یاسمیدا « مێژوی نەژاد و پەیوەسـتەگی کورد » ، کە رەخنەمان لێ گرتووە ، ئاشکرا دیارە ، کە چۆن مێژونوسـانی قەومی بۆرجوازی فارسی لە ئێراندا بە ئارەزوی خۆیان رەوزەوەی مێژوی کورد وەردەچـەرخێنن و دەشێوێنن . رەشید یاسمی لەم رێـگەیەوە پاکانە بۆ ئەو سیاسەتە کۆنەپەرستەی ناوخۆی ئێران دەکات ، کە بەرامبەر بە گەلی کورد لە ئێراندا پەیرەوی دەکرێت . بۆ ئەم مەبەستە ئینـکاری میللەتانی تری

خاوەن کولتور و زمانی خۆ دەکات . نوسینی کتێبەکەی لەسەر بنچینەیەکی شۆڤێنتی فارسی وای لێ کردوە ، کە تەماشای مێژوی کورد ، وەك مێژوی « نۆکەران و پارێزەرانی تاجی ئێران » بکات . رەشید یاسمی سیاسەتی داگیرکردنی خاکی بێگانە بڵاودەکاتەوە . پروپاگەندە دژی کورد دەکا ، کە گوایا سەرشۆڕ و نۆکەری حکومەتی شای کۆنەپەرست بون .

* * * * * *

# ڕەخنە لە بیر و باوەڕی هەڵە لە بارەی زمانی کوردییەوە

ئەم وتارە لە ساڵی ١٩٥٥دا لە گۆڤاری « کورتەی دەنگوباسی ئامۆزگای ڕۆژهەڵاتناسی »دا بڵاوکراوەتەوە ، ب ١٢ ، ل ٤٣ ـ ٦٢ . هەرچەندە بەسەر بڵاوکردنەوەیدا ماوەیەکی زۆر تێپەڕیوە ، بەڵام تاکو ئێستا یەکێکە لەو وتارە گرنگانەی لە بارەی زمانی کوردییەوە نوسراوە ( وەرگێڕ ) .

بۆ نیشاندان و خستنە بەرچاو و ئاشکراکردنی ئەو بیر و باوەڕە هەڵە و نازاست و دوور لە زانستییانەی ن. یا مارر و هەروەها بۆ شیکردنەوەی بیر و ڕای چەوت و وشکی شاگردان و لایەنگیرانی ن. یا. مارر ، کە لە بارەی زانستی زمانەوە نوسیبویان ، زمانناسانی سۆڤێت و بەتایبەتی زانایانی ئامۆزگای زمانەوانی ئەکادیمیەی زانستی سۆڤێت دەورێکی گەورەیان بینیوە و گەلێك کاری تیۆرییان بڵاوکردۆتەوە و ئەو تۆوە پڕ زیانەی چاندبویان هەڵیان گێڕایەوە.

پێویستە ، ئەوە لە بیر نەکەین کە دوور کەوتنەوە لە هەڵەکانی

ن. یا. مارر و لە ناوبردنی ئەو باوەڕە کاڵ و کرچانە ، نەك تەنها کارێکی مەزنە دژی ئەو تیۆرییە زمانەوانیانەی ن. یا. مارر ، کە لەسەر بناغەیەکی چەوت و چەوێڵ و دوور لە زانست هەڵچنرابوون ، بەڵکۆ خەباتە دژی ئەو کەسانەش کە بە باشی تێنەگەیشتبوون و پشتگیری ئەو بیر و باوەڕە چەوتەی ن. یا. مارریان دەکرد . لەم ڕووەوە لە ناو ڕۆژهەڵاتناسەکانیشدا هەبوون ، کە لە ناشارەزایی خۆیانەوە گەلێك هەڵەیان کردوە لە ڕێگای پێشکەوتنی ئەم زانستەدا و بۆ تەماشا کردنەوەی ئەو هەڵوێستە نڕاستانەی نەك تەنها دەربارەی زمانەکانی ڕۆژهەڵات ، بەڵکو هەروەها دەربارەی فۆلکلۆر و ئەدەب و مێژووی میللەتەکانی ڕۆژهەڵات هەن پێویست بە خەباتێکی سەخت هەیە . هەروەها ئەوەش دەهێنینەوە یاد ، کە تاکو ئێستا نووسراوێکی وەهامان لە بارەی کوردناسییەوە نییە ، کە لە بەر ڕۆشنایی بیر و باوەڕێکی مارکسی نووسرابێت . بۆیەکا لەم بارەیەوە بە پێویستی دەزانین ، بە وردی لەسەر بیر و باوەڕێکی مارکسی ڕەخنە لە کوردناسان بگرین .

بەر لە شۆڕشی ئۆکتۆبەری مەزن ، کوردناسی لە وەزعێکی ژێردەستیدا بوو . زمانی کوردی دەخوێنرا و لێی دەکۆڵرایەوە ، نەك وەك زمانێکی تایبەتی ، نەك وەك زمانی نەتەوەیەك ، بەڵکو وەك کەرەستەی یاریدەدەر بۆ لێکۆڵینەوە لە زمانی فارسی کۆن . لەباتی ئەوەی کوردناسی لەو ژێر دەستییە ئازادبکرێ و شێوەیەکی سەربەخۆ وەربگرێ ، کەچی هەندێ لە کوردناسان دەستیان کرد بەوەی ، کە کوردناسی بە ڕێگایەکی چەوتا بەرن .

له سەرەتای سـەدەی بیستەمدا ، له نیوان رۆژهەلاتناسانی رۆسدا ، لەسەر چۆنیتی پەیدابوون و میژووی زاراوەی «چەلەبی» ، که له زمانی کوردی و عـەرەبی و تورکیدا بۆ مانـای : بەشـەرم ، بەناموس ، گۆرانی بیژ ، قاچاغ ، چەتە ، قۆشمە ..... هتـد بەکار دەهینری ، باوەری جیاواز هەبوو . دەربارەی ئەم زاراوەیە گەلیـك وتار بلاوکراوەتەوە و له نیوانیاندا وتـاری ن. یا. مارر له ژیر ناوی « دیسان دەربارەی وشەی چەلەبی » و «بایەخی کولتوری میللەتی کورد له میژووی رۆژهەلاتی ناوەراستدا » (۱) بەرچاو دەکەوی.

راستە ، نووسەر لەم وتارەدا گەلیك نموونەی جوانی سەبارەت بە دەوری کورد له میژووی کولتوری میللەتانی رۆژهەلاتی ناوەراستدا هیناوەتەوە و نیشانی داوە ، کە چۆن کورد له سەدەکانی ۱۰ ـ ۱۳دا دەوریکی گەورەی بینیوە له پیکەیاندنی ئاسـیای بچووك و له سازکردنی کولتوریکی بەنرخ له میژووی میللەتانی پشت قەفقاسدا . بەلام ئەوەی جیگەی رەخنە و سـەرسورمانە ، ئـەوەیە کە ن. یا. مارر تەماشـای میژووی میللەتی کورد دەکا و لیـی دەکۆلیتەوە نەك وەك لـە میژووی میللەتیکی جیاواز و سـەربەخۆ ، بەلکو وەك میژووی یافیتی ( جۆرجی ، خالدی ، ئەرمەنی ) .

له ئەنجامی لیکۆلینەوەی له مانای وشەی « چەلەبی » و هەروەها

---

(۱) ن. یا. مارر « دیسان دەربارەی وشەی چەلەبی ، « دەستنووسەکانی بەشی رۆژهەلاتناسی کـۆمەلی ئارخیۆلـۆژی » ، پیتروسبورگ ۱۹۱۲ ، ب ۲۰ ، ل ۹۹ ـ ۱۰۱ .

وشەی « کورد » — کە یەکێکە لە نەتەوە ئێرانیەکان و کە زمانەکەشی هەر لە بەشی زمانە ئێرانیەکانە ، ن. یا مارر هاتۆتە سەر ئەو باوەڕە هەڵە و چەوت و چەوێڵەی کە ئەسڵی کورد و زمانی کوردیی بە یافیتی دابنێ و بڵێ : « وێکچوونێکی زۆر ئاشکرا لە نیوان رەگی (کارد ، رەسپ ، کۆرد ) و رەگی ناوی گروزین[2] — ( قەرد ، قۆرد + و ) ..... دا دەبینرێ بەلای ئێمەوە سەیر نییە ، ئەگەر لەبەر تێپەڕبوونی ماوەیەکی درێژ وشەی کاردوخ ( کورد ) و قارتو ( گروزین ) هەندێ لەیەك دوورکەوتبنەوە و ئێستا هەزاران ساڵە کە لەیەك دوورکەوتوونەتەوە . دیارە لە زمانی کوردیدا گۆڕانێکی بنەڕەتی رووی داوە و بە تەواوی لە شێوەی یافیتی لای داوە »[3] . پاش ئەوە ن. یا. مارر نیشانی دەدا ، کە « هەموو مانا ئاینیەکان و کۆمەلایەتیەکانی وشەی ( چەلەبی ) لە زمانی کوردیدا زۆر لە پێش سەرەتای سەدەی چواردەهەمدا پەیدابوون — واتە بەر لەوەی ئەم نەتەوەیە شێوەی ئێرانی وەربگرێ »[4] .

ئایا دەتوانرێ بوترێ ، زمانی کوردیی کە زمانی نەتەوەیەکی زۆی ئەو هەرێمەیە کەوتە ژێر تاسیری زمانە ئێرانیەکان و شێوەی ئەوانی وەرگرت ؟ ئەمە تەنها خەیاڵێکی خاوە و بۆ سەلماندن و چەسپاندنی ئەو خەیاڵە خاوە پێویستە گەلێك نموونەی مێژوویی و

---

(٢) جۆرجی .

(٣) سەرچاوەی ناوبراو ، ن. یا. مارر ، ل ١٣٩ .

(٤) هەمان سەرچاوە ، ل ١٥٠ .

زمانی و ئەتنۆگرافی نیشان بدرێ ، بەڵام تاکو ئێستا هیچ نیشان نەدراوە . بێمانایە هەر لەبەر ئەوەی چەند وشەیەکی کوردی لەگەڵ چەند وشەیەکی جۆرجی و ئەرمەنیدا وێکدەچن بوترێ ، کە زۆ کورد بە زمانەکانی یافیتی دەدوان .

بە رای ن. یا. مارر لە سەدەکانی ١٠ — ١٢دا چ کورد ، چ زمانی کوردی کەوتنە تێکەڵاوبوون لەگەڵ چەند زمانێکی تردا . لەم روەوە نوسیویەتی : لەم ماوەیەدا بەشێك لە کورد کەوتە تێکەڵاوبوون لەگەڵ عەرەب ، بەشێکی کە لەگەڵ نەتەوە ئێرانیەکان ، وە بەشی سێهەم لەگەڵ توركدا . نوسەر لێرەدا بەتایبەتی لەسەر ئەوە زۆر دەڕوا ، کە گوایا دوا دەوری پێشکەوتنی کورد — ئەو دەورەیە ، کە بە تەواوی شێوەی تورکی وەرگرت . لەسەر ئەم باسە ن. یا. مارر دەڵێ : « بەشێك لە کورد لەسەر زبانی زۆی خۆیان و لەسەر ئاینی خۆیان مانەوە . ئەو زاراوە کۆنانەیان وەك نوێ لێکرد و وەریاگێڕایە سەر زمانەکانی ئێرانی و عەرەبی . ئەو بەشەی کە بەشێکی گرنگ بو لەگەڵ ئیسلام ( تورك )دا لە ئاسیای بچوك کەوتنە تێکەلاوبون و ئاینی ئیسلامیان وەرگرت و لە زبانی خێڵایەتییەوە بەرەو زبانی دەوڵەت بزوتنەوە .... »[٥] .... « لە وشەی ( چەلەبی ) — ئێمە مەبەستمان لەو بەشە ( کوردە — ق. کوردۆ ) گەورەیە کە مێژۆی نەتەوەی خۆیان دروست کردوە » ، کە وا « لە دەور و بەری سەدەی ١٤دا ، بێوستان ، یەك پارچە یاخود بەشێکی زۆری لەگەڵ تورك — سەلجوقی تێکەڵ بو و هەردو وشەی ( چەلەب ) و ( چەلەبی )

---

(٥) هەمان سەرچاوە ، ل ١٤٩ .

هێنایە ناو زمانی خۆیەوە »[٦] .

بەم باسەی ن. یا. ماررداوا دەردەکەوێ :

١— دەوری پێش تێکەڵاوبوونی کورد لەگەڵ تورك و زمانی کوردی لەگەڵ زمانی تورکی - ئەمە ئەو دەورەیە کە زمانی کوردی وەك یەکێك لە زمانەکانی یافیتی . شێوەی ئێرانی وەردەگرێ .

٢— پاش ئەوەی زمانی کوردی شێوەیەکی ئێرانی وەرگرت ، دەستی کرد بە تێکەڵ بوونێکی تەواو لە گەڵ زمانی تورکی . بەم جورە زمانی کوردی کە شێوەیەکی تورکی وەردەگرێ ، دەگەڕێتەوە بو سەدەکانی ١٢ - ١٤ .

٣— زمانی کوردی لە کۆمەڵێك لە زمانانی جیاواز پێکهاتووە .

ئەم لێکولینەوە ناراستە چەوتانەی ن. یا. مارر یارمەتی ئەوە دەدەن ، کە لێکوڵینەوە لە نەژادی کورد و لە زمانی کوردی بەرەو و ڕێگایەکی خراپ بەرن ، وە ببن بە کۆسپ لە ڕێگای پێشکەوتنی زمانی کوردیدا .

لایەنگیر و بڵاوکەرەوەی ئەم تیۆرییەی ن یا. مارر دەربارەی سروشتی زمانی کوردی و پێشکەوتنی ئو. ل. ڤیلچێڤسکی و ب ڤ میللیر بوون . ئەمان نەك تەنها پشتگیری ئەم « لێکۆڵینەوە نوێیە بوون دەربارەی زمان » کە دژی زمانە ئێرانیێکانە ، بەڵکو لەگەڵ تێکزانی بیر و باوەڕەکانی ن. یا. ماررداا بوون .

---

(٦) هەمان سەرچاوە ، ل ١٢٠ - ١٢١ .

ئۆ ل. ڤیلچێڤسکی لە هەموو نووسراوە مێژوویی و ئەتنۆگرافی و ئەدەبی و زمانەوانییەکانیدا مەرامی هەرە گەورەی ئەوە بوو کە تەشەنە بە نووسینەکانی ن. یا. مارر بدا و بیان چەسپێنێ و جێگیریان کات. لەم بارەیەوە ئەو نووسیویتی: «وام نیازە لە ژێر ناوی «کەرەستەی زمانەوانی دەربارەی مێژووی شێوەی کۆمەلایەتی لە کوردستان»دا چەند وتارێك بنووسم دەربارەی هەندێك وشە، کە لە کوردیدا ماون و پەیوەندییان لەگەڵ وشەی «چەلەبی»دا هەیە و گرنگییەکی مێژووییان هەیە ...»[7]. هەروەها ئۆ ل. ڤیلچێڤسکی لەسەر ئەو باوەڕەیە، کە لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی پێویستە تەنها لە سەر ئەو ڕێگایە بێت کە ن. یا. مارر نیشانی داوە. بەم بۆنەیەوە نووسیویتی: «پاش پەیدابوونی ئەم نووسینە (نووسینەکەی ن. یا. مارر) پێویستە پێشکەوتنی کوردناسی و لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی لەو ڕێگایەوە بێت کە ن. یا. مارر نیشانی داوە تەنها لەو ڕێگایەوە دەتوانرێ گەلێك کاری ئاڵۆز خاو بکرێتەوە. هەر هەولێك بۆ گەڕانەوە سەر ئەو باوەڕانەی کۆن بدرێ ڕێگا لە راستی دەبڕێ، وە هەموو لێکۆڵینەوەیەك لە بنچینەی زانستی بێبەر دەبێ»[8]

ئۆ ل. ڤیلچێڤسکی دژی ئەو ڕێگا راستە مێژووییە راوەستاوە، کە بۆ لێکۆڵینەوەی زمانە ئێرانییەکان و بە تایبەتی بۆ زمانی کوردی بەکار دەهێنرێ. ئەو بانگی کوردناسان دەکات، کە لە لێکۆڵینەوەی

---

(٧) زمانە ئێرانییەکان، ب ١، ل ١٤ ـ ١٥.

(٨) بیر و زمان، ب ١، ١٤ ـ ١٥.

زمانی کوردیدا لەسەر ڕێگای ن. یا. مارر بڕۆن ـ واتە لەسەر بناغەی وشە و زاراوەی کۆمەڵایەتی .... ئو. ل. ڤیلچێڤـسکی نوسیویێتی : « تا ئەو کاتەی ئێمە لە دەوری کورد و زمانی کوردی دەمێنینەوە ... کە ڕەستەی سەرەکی بۆ ئێمە هی دەوری هەرە پێشووە لە فۆلکلۆر و داستانەکاندا .... »[9] .... « بۆ دەورەکانی هەرە پێشوو لە پێشکەوتنی زمان ، لێکۆڵینەوە لەسەر شێوەی بەراوردکردنی زمان بە هیچ جۆرێك ڕاست نییە . بەم جۆرە ، لێرەدا ڕاستی لێکۆڵینەوەکانی ن. یا مارر دەردەکەوێ ، کە لەسـەر بناغەی وێکچوونی مانای وشەیە .... »[10] .

دوا بە دوای ن یا. مارر ، ئو. ل ڤیلچێڤسکی تەماشای زمانی کوردی دەکات وەك زمانێـکی تێکەڵاو ، کە ڕێـگای پێشکەوتنی لە زمانەکانی یافیتیەوە دەسـت پی دەکا و دوایی لە ڕێـگای زمانە ئێرانیـەکان و عەرەبیەوە بەرە و زمانی تورکی دەڕوات . ئەم ڕێـگای پێشکەوتنەی زمانی کوردی و « چوونی » یاخود « بوونی » لە زمانێکەوە بۆ زمانێـکی‌تر ، وەك ئو. ل. ڤیلچێڤـسکی باس دەکا گۆڕانێـکی خێرا و پەلەیە لە ژیانی کۆمـەڵایەتی و ئابوری و سـیاسی گەلی کورد و مێژوی پێشکەوتنیدا . بەم شێوەیە ئەوەی ن یا. مارر دەربارەی کورد نوسیوێتی ، ئو ل ڤیلچێڤسکی دوبارەی دەکاتەوە و فراوانتری دەکا و بەم جۆرەی خوارەوە نیشانی دەدا .

---

(٩) زمانە ئێرانیـەکان ، ب ١ ، ل ١٥ .

(١٠) هەمان سەرچاوە ، ل ١٧ .

١- کورد لە ئەسڵدا خەڵکی زۆری ناوچە شـاخاوییەکانی ئاسیای بچووکن و زمانی کوردی لەم ناوچەیە دروست بووە ، نەك لە شوێنێکی تری زەوی ئەم جیهانە .

٢- پێشکەوتنی شێوەی کۆمەڵایەتی و ئابووری هەڵگری ئەم زمانە و هەروەها ئەنجامی گۆڕانی ژیانی کورد لە کولتووریدا ، بۆ بە هۆی گۆڕانێکی بنەڕەتی و هۆی دوورکەوتنـەوە لە زمانەکانی یافیتی ، کە هاو زمان بۆ[11] لەگەڵ جورجی و خالدی و ئەرمەنیدا . ئەو ( زمانی کوردی - وەرگێڕ ) لە زمانەکانی هیند و ئەورووپایی نزیك بووە و دواکات ، واتە لە دەوری دەرەبەگایەتی کوردستاندا بەرەو زمانی تورکی کەوتەڕێ »[12] .

هەر لەبەر ئەوەی لە زمانی کوردیدا چەند وشەیەك هەن ، کە لە زمانی تورکییـەوە نزیکن ، ئو . ل . ڤیلچێفسکی دەڵێ ، کە گوایا لە سـەدەی ١٣ دا لە تورکیا زمانی چینی سەرکاری کورد تێکەڵ بە زمانی تورکی بۆ ، بەڵام زمانی چینی زەحمەت کێش هەر لەسەر شێوەی کۆنی دەڕۆیشت کە لە یافیتی و ئێرانی و عەرەبی بۆ ..... « پاش ماوەیەك ، لە سـەرخۆ زمانی چینی زەحمەت کێش لە زمانە سامییەکان نزیك دەبێتەوە . لەبڕ لە زمانە سامییەکان دوور دەکەویتەوە و

---

(١١) واتە زمانی کوردی لەگەڵ زمانەکانی جورجی و ئەرمەنی هاو زمان بۆ ( وەرگێڕ ) !

(١٢) بیر و زمان ، ب ٨ ، ل ٢٢٥ .

وەك زمانی چینی دەرەبەگی سەرکاری ئەو دەورەی لێ دێت »[13] .

ئو. ل. ڤیلچێڤسکی جگـــە لە هـــەمو ئەو وتە بێمانایانەی توسیوێتی ، کە چی هێشتا دەیەوی بیچەسپێنێ کە وا « لە مێژە نیشان دراوە ، کە ن. یا. مارر یەکەمین لێکۆڵینەوەی راستی دەربارەی وێـکچوونی وشە و رستەی کوردی و تورکی پێشکەش کردوە »[14] .

ئاشکرا نییە ، کە ئو. ل. ڤیلچێڤـسکی دەربارەی چ وشـــە و رستەی کوردی توسیوێتی . هەروەها ئاشکرا نییە ، کە چ زانایەك لە مێژە نیشـانی ئەو وشە و رستانەی داوە کە وێـکدەچن. خـۆی هیـچ نمونەیەکی لەم بارەیەوە نەهێنـــاوەتەوە . ئو. ل. ڤیلچێڤـسکی ئەمەی نەکردوە ، چونـکە ئەوە نەبووە و شتی وەها نییە .

ئو. ل. ڤیلچێڤسکی لە وتاری « کەرەستەی زمانەوانی دەربارەی مێژوی شێوەی کۆمەلایەتی لە کوردستان »و لە وتاری « پێشکەوتنی زمانە زیندوەکانی ئێران »دا[15] زمانە ئێرانیـکانی ناوچەی ئێران بەسەر زمانی ئەدەبی و زمانی گـفتوگـۆدا دابەش دەکا بەم جـۆرە زمانی فارسی ـ بەزمانی ئەدەبی ، وە زمـانی گـفتوگـۆ ـ بە زمانی فارسی زیندو و دیالـێکتەکانی زمانی کوردی دەدانە قەڵەم ..... . توسیوێتی : زمانی ئەدەبی ـ لەسەرێکەوە زمانی چینی بەرێوەبەرانە و لە سەریکی کە شەوە یەکـێکە لە زمانە هیندو ئەوروپاییەکان . زمانی

---

(١٣) ئەکادیمیەی زانستی سۆڤیێت بۆ ئەکادیمی ن. یا. مارر ، ل ١٩٤ .

(١٤) بیر و زمان ، ب ٨ ، ل ٢٢٢ .

(١٥) زمانە ئێرانیکان ، ب ١ ، ل ١٣ ـ ٣٠ .

گفتوگۆ ـ زمانێکی زیندوە و پەیوەندییەکی کۆن و بە هێزی لەگەڵ زمانەکانی ئافیتیدا هەیە ، یاخود هێشتا لە دەوری یافیتتی دان .

لەبەر رۆشنایی لێکۆڵینەوەکانی ئو. ل. ڤیلچێڤسکیدا وا دەردەکەوێ ، کە کورد میللەتێکی رەسەن نییە و خاوەنی یەك زمان نییە ، بەڵکو لە جیاتی یەك زمان کە هەمو کۆمەڵی کورد تێی بگەن خاوەنی سێ چوار زمانن ، وە چ لە چۆنێتی دروست بوندا و چ لە چۆنێتی پێشکەوتنندا زۆر جیاوازن لە یەکتر . هەر لەبەر ئەم باوەڕەشە دەڵێ : « لە زمانی کوردیی ، راستتر لە زمانە کوردییەکان دەبێ باش بکۆڵرێتەوە ، واتە لە سەر شێوەی زانیارییەکی نوێ . ئەوسا گەلێك دەوری لە بیرکراوی ئادەمیزاد ئاشکرا دەبێ »[(١٦)].

نزیکەی لە هەموو نوسینەکانی ئو ل. ڤیلچێڤسکیدا کە دەربارەی کورد و زمان و ئەدەب و مێژوی کۆمەڵایەتی کوردن ، باش دەردەکەوێ کە یەکێکە لە چالاکترین لایەنگیران و پروپاگەندەکەرانی تیۆرییە چەوتەکانی ن. یا. مارر دەربارەی رەگەزی کورد و زمانی کوردیی . لە هەمو نوسینەکانیدا تەشەنە بە بیر و باوەڕەکانی ن. یا. ماری مامۆستای دەدات . بە هەمو چەشنێك هەوڵی داوە نیشانی بدات ، کە کورد خاوەنی زمان و هەروەها خاوەنی مێژو و کولتوری خۆیان نین .

ئەم ناراستیانەی لە وتاری « چاپەمەنیە کوردییەکانی دەرەوە ،

---

(١٦) ئەتنۆگرافیای سۆڤێت ، ژ ٥ ـ ٦ ، ل ١٢٣ .

کە لە سەدەی بیستەمدا لە چاپ دراون »[17] دەخاتە ڕوو .

لەبەر ئەوەی لە نێوان کوردی تورکیا و سوریا و عێراق و ئێران جیاوازی هەیە لە نوسین و سەرچاوەی وەرگرتنی هەندێ وشەدا ، ئو. ل. ڤیلچێڤسکی زمانی ئەدەبی کوردی دەرەوە دابەش دەکا بەسەر سێ گروپی جیاوازدا . بە باوەڕی ئەو لە جۆری پێشکەوتنیدا جیاوازی زۆرە ، وەك هەر لایەك بە ڕێگای زمانێکی جیاوازدا ( ئنگلیزی ، فەرەنسی ، عەرەبی ، تورکی ... ) پێشکەوتووە . بەم بۆنەیەوە ئو. ل. ڤیلچێڤسکی نوسیویەتی : « لە بارەی زمانەوە ، ئەو چاپەمەنیە نوێیانەی دەرەوە ، بەلایەنی کەمەوە دەتوانرێ دابەش بکرێن بەسەر سێ گروپدا ، کە ئەم گروپانە . چ لە شێوەی دروست بون ، چ لە بارەی جیاوازی وشە و چ لە جیاوازی نوسینەوە زۆر لەیەك جیاوازن »[18] .

بە باوەڕی ئەو « ئەو چاپەمەنیانەی بە کرمانجی ژوروو لە سوریە و لە سالانی یەکەمی پاش شەڕی جیهانی لە ئەستەمول دەرچوون سەر بە گروپی یەکەمن . هەرچەندە زمانی ئەم ئەدەبیاتانە لە زمانی ئەدەبیاتی کلاسیکی سەدەکانی ناوەڕاست نزیکن ، بەلام لە ژێر تاسیرێکی بە هێزی زمانی فەرەنسی و تورکی دان . نوسینی لاتینیشیان لەسەر بناغەی ئەو لاتینیە تازەیەی کە لە تورکیا هەیە ،

---

(١٧) زمانە ئێرانێکان ، ب ١ ، ل ١٤٧ – ١٨١ .

(١٨) هەمان سەرچاوە ، ل ١٥٥ – ١٥٦ .

وەرگرتوە »[19] .

« ئەو چاپەمەنیـانەی بە دیالێـکتی کرمانجیی خوارو لە عێراق بڵاوکراونەتەوە » دەخاتە گروپی دووەمەوە . هەروەها دەڵێ : « زمانی ئەم ئەدەبیاتانە زۆر دوورە لە زمانی ئەدەبیاتی سـەدەکانی ناوەڕاست (هەرچەندە کەوتبوە ژێر تاسیری) . ئاشکرایە ، کە ئێستا بە یەکجاری لە سنووری ئەدەبیاتی سـەدەکانی ناوەڕاست دوورکەوتۆتەوە و کەوتۆتە ژێر باری تەواوی زمـانی عەرەبی و ئنـگلیزی . نوسـینی لاتینی دیالێـکتەکانی کوردی خوارو لەسەر بناغەی ئەلف و بێیەکی تایبەتییە ، کە هەندێ لە خوێنـدەوارانی ئەو ناوچەیە بە هۆی نزیکیان لە ئنگلیزەوە لەسەر شێوەیەکی نزیك لە نوسینی ئنگلیزییەوە دایان ناوە »[20] .

لە کۆتاییدا بۆ گروپی سێیەمی زمانی ئەدەبی کوردی دەڵێ : « ئەو چاپەمەنیانەی بەدیالێکتی موکری و بە هەندی دیالێکتی کوردی عیراق بڵاوکراونەتەوە ، وا دەردەکەوێ کە بۆیەکەم جار نوسینیان پەیدابووە . ئەم زمانانە لە ژێر تاسیری فارسی وعەرەبی و ئنگلیزی دان ، وە نوسینیشیان لەسەر شێوەی نوسـینی زمانی عەرەبییە یاخود بە لاتینییەکی لاوازە »[21] .

جگە لەوە ، هێشتا ئو. ل ڤیلچێڤسکی دەڵی : « لەگەڵ هەمو

---

(١٩) هەمان سەرچاوە ، ل ١٥٥ – ١٥٦ .

(٢٠) هەمان سەرچاوە ، ل ١٥٦ .

(٢١) هەمان سەرچاوە ، ل ١٥٦ .

ئەو جیاوازییانەی لە ناو ئەم زمانانەدا هەن ، هێشتا هەر گروپێکیان بەسەر چەند دیالێکتێکی بچوکدا دابەش دەبێ ، کە هـــەر یەك بە جیاوازی پێش دەکەوی »[٢٢] .

ئاشکرایە ، کە ئـەم تیۆرییەی ئو. ل. ڤیلچێڤسکی (دەربارەی کورد و زمانی کوردی) لەسەر بناغەیەکی زانستی نییە ، لەبەر ئەوە بێ سود و بێ کەڵـکە .

ئەگەر ئەو نوسینانەی ئو. ل. ڤیلچێڤسکی لەســـەر بناغەیەکی زانستی و لەســەر لێکۆڵینەوەی بەرهەمی شـــاعیران و ئەدیبانی ناوچەکانی کوردستان بوایە ئەوسا ســەرکەوتو دەبو ، بەلام هەڵە و ناتەواوی ئو. ل. ڤیلچێڤسکی ئەوەیە کە ئەو کەرەستە پێویستانەی لە لێکۆڵینەوەکانیـدا بەکار نەهێناوە و بەکار هێنانی بـــە پێویست نەزانیوە .

تەنها ئەوە بەسە کە بڵێین ، ئو. ل. ڤیلچێڤسکی هیچ کاتێك لە رێزمانی کوردی و وشەکانی بەتێکڕایی و شێوەی نوسینی ئەدەبیاتی کوردی نەکۆڵیوەتەوە و نەدواوە . بەڵـگەشمان بۆ ئەمە ئەوەیە ، کە لە هەمو نوسراوەکانیـدا کە کورد بـــە یافیتی دادەنێ و دەربارەی چوێتی گۆڕانی زمانی کوردی کۆڵیوەتەوە .... هتد لەسەر بناغەی هەشتا وشە و دوازە رسـتەی دو وشەیی و گۆڕانیەکی دە دێڕی کوردییە . ئەمە هەمو ئەو کەرەسـتەیەیە کە ئو. ل. ڤیلچێڤسـکی لە لێکۆڵینەوەی زمان و ئەدەبی کوردیدا بەکاری هێناوە بۆ دانانی ئەو

---

(٢٢) هەمان سەرچاوە ، ل ١٥٦ .

تیۆرییەی . بڕوا ناکەین ئەو کەرەستە کەمە بۆ سەلماندنی چەسپاندنی ئەو بیر و باوەڕە چەوتەی تەواو بێت .

پاش ئەوەی زانایانی سۆڤیێت گەلێك کاری تیۆری و رەخنەی توندیان دژی بیر و راکانی ن. یا. مارر بڵاوکردەوە و ئەو تۆوە پڕ زیانەی چاندبوی هەڵیان گێڕایەوە ، ئـو. ل. ڤیلچێڤسکی بە هیچ جۆریك نە بە وتار ، نە لە کۆبونەوە زانستێکاندا ، نە لە سەر لاپەڕەی گۆڤارەکان دەربارەی تیۆرییەکەی ن. یا. مارر و رەگەزی کورد و زمانی کوردی بەشداری نەکردوە . تیۆرێ کانی کە دژی زانستن لە یەکێتی سۆڤیێت زیانێکی گەورەیان لە کاری لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی دا لەبەر ئەوە، ئێمە بە راستی دەزانین داوا لە ئو. ل. ڤیلچێڤسکی بکەین کە بە نوسین رەخنە لە هەڵوێستە نازاستەکانی خۆی بگرێ ، کە سەبارەت بە مێژو و ئەتنۆگرافیا و زمــان و ئەدەبی کوردی هەیبوە ، وە بڵاوی بکاتەوە .

هەروەها ئی. ئی تسوکەرمانیش ، کە زانایەکی نەخراپی زمانی کوردییە ، پتر هەوڵی پشتگیر کردن و بڵاو کردنەوە و پروپاگەندەکردنی تیۆرێکەی ن. یا. مارر بو ، وەك لەوەی خۆی لە زمانی کوردی بکۆڵێتەوە .

ئی. ئی. تسورکەرمان نیشـــانیدا کەیەکێکە لە چالاکترین لایەنگیران و شاگردانی ن. یا. مارر . بۆ ئەمەش بەڵگە ئەوەیە ، کە چەند جارێك بە نوسین پشتگیری خۆی بڵاوکردۆتەوە .

له کۆبوونەوە زانستێکانی (ئامۆژگای زمان و بیر) دا ، له کۆبوونەوەکانی بەشی فیلۆلۆژی ئێراتی له ئامۆژگای رۆژهەلاتناسی ئەکادیمیەی زانستی سۆڤێتدا ، هەروەها له هەندێ شوێنی‌تر ئەو ئەدوا نەك تەنهـا وەك لایەنگیرێکی « لێکۆڵینەوەی نوێ له بابەت زمانەوە » ، بەڵکو وەك خـۆی خاوەنی تیـۆری بێت و وەك مارکسی‌یەك له زمانەوانیدا ، بە تایبەتی له کوردناسیدا .

شکی تیدا نییه ، که خۆ خەریك کردنی ئی. ئی. تسوکەرمان به بڵاوکردنەوه و پروپاگەندە کردن بۆ تیۆرێکەی ن. یا مارر وای لێ‌کرد ، که نەتوانی و فریا نەکەوی باش زمانی کوردی بخوێنێ و وفێربێ . بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە که له ماوەی ۱۰ — ۱۵ ساڵدا دەربارەی زمانی کوردی ، تەنها دوو لێکۆڵینەوەی بڵاوکردۆتەوە : « هەندێ خاسـیەتی گروپی دووەمی پێشگر و پاشگر له زمانی کوردیدا »[۲۳] ، وە « رێزمانی زمانی کوردی »[۲٤] .

له لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا ئی ئی. تسوکەرمان هەردەم دەیویست دەریخا و نیشانی بدا ، که یەکەم کوردناسـە توانیویێتی له رێزمانی کوردیدا هەندێ شتی نائاشکرا بدۆزێتەوە . بە تایبەتی له وتاری « هەندێ خاسیەتی گروپی دووەمی پێشگر و پاشگر له زمانی کوردیدا » ، که شتی وەها له زمانی کوردیدا نییه و ئەو به هەڵه ئیزافه و هەندێ شێوەی کرداری کردوە بە گروپی دووەمی پێشگر و

(۲۳) زمان و بیر ، ب ۱۱ ، ۱۹٤۸ ، ل ۳٦٤ ـ ۳۷٥ .

(۲٤) زمانە ئێرانیەکان ، ب ۱۱ ، ۱۹٥۰ ، ل ۷۸ ـ ۱٤٤ .

پاشگر ، وە وای نیشان داوە کە شتێکی تازەی دۆزیوەتەوە بەڵام ئەم باسە « ئیزافە و هەندێ شێوەی کردار » لە مێژە ئاشکرایە و لە سەریان نوسیوە و لێی کۆڵیونەتەوە[٢٥] ، وە ئەم بەشە بە تەواوی لە رێزمانی کوردیدا لەسەر شێوەیەکی زانستی کۆتایی پێ هاتووە . ئی. ئی. ئ-وکەرمان بە هیچ جۆرێك پەنجە بۆ ئەو وتارانەی پێش خۆی بڵاوکراونەتەوە ، راناکێشێ . لە وتارەکەیدا کەوتۆتە لێکۆڵینەوە لە ئیزافە ، لە پاشا دێتە سەر ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکەی . لێکۆڵینەوە و ئەنجامەکانی هەر ئەو لێکۆڵینەوە و ئەنجامانانن کە لە ساڵی ١٩٢٣دا هەر دوو نوسەری ناوبراو ( ئی. ئی. ئ-وکەرمان و ق. کوردۆ ) گەیشتبونێ . دووەم نوسراوی ئی. ئی. ئ-وکەرمان « رێزمانی زمانی کوردی » یە . هەرچەندە لەم کتێبەدا تا رادەیەك بە شێوەیەکی باش و رێكوپێك باسی رێزمانی زمانی کوردی کردوە ، بەڵام هیچ لێکۆڵینەوەیەکی نوێ و نەزانراوی تێدا نییە .

ئی. ئی. ئ-وکەرمان هەردەم دەیەوێ بێهاوتایی خۆی لە زانینی زمانی کوردیدا نیشان بدات . ئەمە لەو رەخنانەدا دەردەکەوێت ، کە ئاڕاستەی کردووە بۆ ئەوانەی زوو لە زمانی کوردی کۆڵیونەتەوە . ئەو نوسیویێتی : « ئەوانەی زوو لە رێزمانی کوردی کۆڵیونەتەوە و نیشانیان داوە کە ( لە کرداردا دروست بونی سست ) هەیە . س. یەگیزارۆف بە شکەوە نیشانی « شێوەیەکی تایبەتی کرداری رابوردوی » داوە ، ف. یوستی و ئا سۆسین زۆر ناڕاست دروست

(٢٥) ئی. ئی ئ-وکەرمان و ق. کوردۆ ، ئیزافە لە زمانی کوردیدا ، « شۆڕش و نوسین » ، ژ ١ ، مۆسکو ١٩٢٣ .....

بۆنی سست لەگەڵ هەندێ شێوەی کردار نیشان دەدەن . لە پاڵ ئەمەشدا ، لە وانەی زۆ لە زمانی کوردی کۆڵیونەتەوە کەس نییە هەستی کردبێ کە دروست بونێکی تایبەتی هەیە ، نەك تەنها بۆ جێناو[٢٦] ، بەڵکو هەروەها بۆ ناویش »[٢٧] .

بە پێویستی سەر شانمی دەزانم ، رۆنی بکەمەوە ، کە ئەم وشانەی ئی. ئی. تسوکەرمان لە راستیەوە دورن . بۆ رون کردنەوەی ئەمە تەنها وردبونەوەیەك لە رێزمانی کوردی جاردین[٢٨] هەمو راستی یەك دەردەخا .

هەروەها نازانم بۆچی ئی ئی. تسوکەرمان بەرامبەر بەکتێبی رێزمانی زمانی کوردی[٢٩] ، کە من نوسیومە خۆی کەرکردوە . لەو کتێبەدا بەتەواوی و رێك و پێکی لە شێوەی جێناو و ناو و ... هتد کۆڵیومەتەوە . بەڵام ئی ئی تسوکەرماز وای دەداتە قەڵەم کە هێشتا هیچ کەس لەم باسە نەکۆڵیوەتەوە .

دێینە سەر تەماشا کردنی نوسینەکانی ب ف. میللیر دەربارەی کوردناسی .

ب ف. میللیر زانایەکی گەورەیە ، دەربارەی زمانە زیندوەکانی

---

(٢٦) رانو ، ضمیر .

(٢٧) زمانە ئێرانیەکان ، ب ٢ ، ل ٨٠ .

R. F. Jardine, Bahdinan Kurmanji , Baghdad 1922 (٢٨)

(٢٩) ق. کوردۆ ، رێزمانی زمانی کوردی ، یەریڤان ١٩٤٨ ، ل ٨٧ – ٨٩ ، ١١٠ – ١١٨

ئێران خاوەنی کەلێك نوسراوە : « نوسراوەکانی تالیش » ، « دیالێکتی زمانی شاری شوستیر » ، « تات و شوێنیان و دیالێکتەکانی زمانیان » ، « نوسراوەکانی تات » .... هتد .

لەم نوسراوانەدا لە رێزمانی ئـەو زمانانە باش کۆڵیـوەتەوە . ئەوەی لەم نوسراوانەدا گرنگ بێت ئەوەیە ، کە لێکولێنەوەکانی زۆر دوورن لە تیۆرییەکەی ن. یا. مارڕەوە ( واتە لە وەی کە ن. یا. مارر ئەسڵی ئەم نەتەوە ئێرانیانەی بە یافیتی داناوە ) ، بەڵام ب. ف. میللێر ئەم نوسراوانەی لەپێش ساڵی ١٩٣٠دا بڵاوکردۆتەوە . لـە سـاڵی ١٩٣٠ـەوە دەبێت بە پشتگیری تیۆری « لێکۆڵینەوەی نوێ دەربارەی زمان » . ئەویش هەر وەك ئو.ل ڤیلچێڤسکی ئەو رێگا چـەوتە دەگرێ و نوسینەکانی لە سـەر بناغەی تیۆرییەکەی ن. یا. مارر دادەرێژێت .

ئەو نوسراوانەی لەسەو بناغەی تیۆرییە چـەوتە ، دوور لـە زانستییەکەی ن. یا. مارر نوسیویێتی ئەمانەن : « لێکۆڵینەوە لە دەقست (دۆسـەد)ی فارسی »[٣٠] ، « ئامرازی کۆ (ئـان) لە زمانە ئێرانیەکاندا »[٣١] ، « پاشگری (i) لە زمانی تالیشـیدا »[٣٢] ، « کارەکانی زانایانی رووس دەربارەی زمانە ئێرانیەکان »[٣٣] ، « هەندێ

(٣٠) کۆکراوەکانی یافیتی ، ب ٧ ، ١٩٣٢ .

(٣١) ئەکادیمیەی زانستی سۆڤێت بۆ ئەکادیمی ن یا. مارر ، ١٩٣٥ .

(٣٢) بیر و زمان ، ب ١١ ، ١٩٤٨ .

(٣٣) نامەی زانایانی زانکۆی مۆسکۆ ، ز ١٠٧ ، ب ٣ ، ١٩٤٦ .

چەڵەمەی فۆنێتیکی زمانی کوردی »[٣٤] و وتارێك دەربارەی « زمانی کوردی » ، کە لە ئینسکلۆپیدیای سۆڤێتیدا چاپکراوە [٣٥] .

ئایا دەتوانرێ بوترێ ئەم بیر و باوەڕەی ب. ف میللیر لەو نوسراوانەدا تەنها نیشانی ئەوە دەدەن ، کە بیر و باوەڕێکی وەقتی بو ، بۆ ئەو سەردەمەی مۆدەی تیۆرێکەی ن. یا مارر بو ؟ من لەو باوەڕەدام کە بۆ سالماندنی ئەمە هیچ بەڵگەیەك نییە . لەم نوسراوانەدا وەنەبی تەنها دەربارەی زمانە ئێرانیەکان چاومان بە چەند هەڵەیەکی بچوك بکەوێ ، بەڵکو چاومان بەوەش دەکەوی کە بەتەواوی بیر و باوەڕی ب. ف میللیر لە ماوەی ٢٠ ساڵدا ( واتە لە ١٩٣ تا ١٩٥٠ ) لە سەر بناغەی تیۆری یافیتی بو ، کە ناویان لێ نابو « لێکۆڵینەوەی نوێ دەربارەی زمان » . ئەو بە هەمو توانایەوە هەوڵی دەدا ئەم تیۆریە بەسەر زمانە ئێرانیەکاندا بەکێشێ ، وە بەسەر زمانی کوردیدا بە تایبەتی بچەسپێنێ .

ب. ف. میللیر لە نوسینەکانیـدا داوای لە ئێرانناسان دەکرد ، کە لێکۆڵینەوە لە لێکسیکۆلۆژی لە ڕێگای « لێکۆڵینەوەی نوێ دەربارەی زمان»ەوە بێت ، وە سور بو لەسەر ئەوەی کە تەنها لەم ڕێگایەوە دەتوانرێ لە زمانی کوردی و زمانە ئێرانیەکانی تر بکۆڵرێتەوە .

---

(٣٤) زمانە ئیرانیەکان ، ب ٢ ، ١٩٥٠ .

(٣٥) ئینسکلۆپیدیای ئەدەبی ، ١٩٣١ ؛ « ئینسکلۆپیدیای گەورەی سۆڤیت » ، ١٩٣٨ .

ئەو تیوریەی ن. یا. مارر، کە کورد بە یافیتی دادەنی بۆ یەکەم جار لە لایەن ب. ف. میللیرەوە لە وتاری « زمانی کوردی »دا[۳٦]. لایەنگیری کرا و تەشەنەی پێ درا. لەم وتارەدا نوسیویتی: « ئەو زمانناسانەی لە زمانە ئێرانیەکان و دیالێکتەکانیان دەکۆڵنەوە بە تەواوی گرنگی نادەن بەو پاشماوانەی کە لەم زمانانەدا ماون، پێش ئەوەی ببن بە ئێرانی. بە تایبەتی هەندێك پاشماوەی فۆنێتیك و مۆرفۆلۆژی، کە وا لە زمانی کوردیدا ماون، نەك تەنها وەك هەندێ لە زمان و دیالێکتەکانی زمانە ئێرانیەکان، بەڵکو وەك زمانەکانی قەفقاسیشن »[۳۷].

ب. ف. میللیر هەمان باوەڕی لە وتاری « زمانی کوردی »دا، کە لە ئینسکلۆپیدیای گەورەی سۆڤێتیدا چاپکراوە، دوبارە کردەوە[۳۸]. لەم وتارەدا نوسیویتی: خاسیەتی تێکەڵاوی زمانی کوردی لەگەڵ زمانەکانی یافیتیدا پتر لە فۆنێتیك و مۆرفۆلۆژیدا دەردەکەوێ.

لە وتاری « دەورەکانی زمانە ئێرانیەکان »[۳۹]دا لە مەسەلەی تێکەڵاوبونی هەندێ لە زمانە ئێرانیەکان دەکۆڵێتەوە و دەڵێ: لە دابەش کردنی زمانە ئێرانیەکاندا « وەنەبێ کەم شتی سەرسام هەبێ

(۳٦) ئینسکلۆپیدیای ئەدەبی، ۱۹۳۱.

(۳۷) هەمان سەرچاوە.

(۳۸) ئینسکلۆپیدیای گەورەی سۆڤێتی، ۱۹۳۸.

(۳۹) ئەکادیمیەی زانستی سۆڤێت بۆ ئەکادیمی ن. یا. مارر.

دەربارەی هەندێ زمان ، وەك : ئەفغانی ، ئەسـیتینی ، کوردی ، دیالێکتی پامیر کە فۆنێتیکیـان بە هیـچ جۆرێك لەسەر بناغەی زمانە ئێرانیێـکان نییە »[٤٠] .

بەم بۆنەیەوە ب ف میللیر ویستویێتی بڵێ ، کە وا لە فۆنێتیکی ئەو زمانە ئێرانیانەی ناری هێماون تەنها لەسەر بناغەی زمانە یافیتێکان دەتوانرێ بکۆڵرێتەوە . هـەروەها لە پاش ن. یا. مارر ئەویش لەو باوەڕەدا بو ، کە گشت زمانەکانی جیهان بە دەوری پێشکەوتنی یافیتیدا تێپەڕبون .

ب. ف میلـــیر زمانناسـانی زمانە ئێرانیێـکانی بە خـەتابار دادەنا ، چونـکە لە لێـکۆڵینەوەی هەر زمانێك لە زمانە ئێرانیێـکان بەپێی دەورەکانی پێشکەوتنی زمانە ئێرانیێـکان نەدەڕۆیشـتن ، بەڵـکو بەپێی بەرامبەر کردنێـکی مێژوویی لە ڕیزمانی زمانە ئێرانیێـکان ، وە زمانەکانی تری هینـــد و ئەوروپایی دەکۆڵینەوە . ئەو نوسیویێتی : « مەسەلەی دەورەکانی پێشکەوتنی زمانە ئێرانیێـکان لەسـەر بناغەیەکی هیند و ئەوروپایی بە هیچ جۆریك لەگەڵ راستیدا رێك ناکەوی»[٤١] .

ب. ف میللیر لە لێـکۆڵینەوەی زماندا ، دژی بەرامبەرکردنی مێژوویی وەسـتابو ، وەك ئەم رێـگایە دوور بێت لە زانست و زۆر سـاکاربێ . ئەو نوسیویێتی : « بونی ئەم مەبەستە لە لێکۆڵینەوەی

(٤٠) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٩٤ .

(٤١) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٩٤ .

ئەو جۆرە باسانەدا شتێکی بێ‌سوودە »[42] ، « لە هەموو شوێنێك شك دەکەین کە لەسەر مەسەلەی مۆرفۆلۆژی ، وە دەربارەی مانا هیچ نووسراوێك هەبێت »[43] . بەم جۆرە پێویستە خوێنەر بێتە سەر ئەو ئەنجامە کە تەنها « لێکۆڵینەوەی نوێ دەربارەی زمان » توانێ هەموو ئەو چەرمەسەریانەی ، کە لە رێگای زمانناسانی زمانە ئێرانیێکاندا هەیە ، سازکا .

ب ف. میللیر بە هەموو جۆرێك هەوڵی ئەوەی دەدا کە زمانناسەکان لەسەر بناغەی « لێکۆڵینەوەی نوێ دەربارەی زمان » وتار بنووسن . لە وتاری « کارەکانی زانایانی رووس دەربارەی زمانە ئێرانیێکان »دا پشتگیری تیۆری ف. ئی. ئەبایێف دەکا دەربارەی تێکەڵاوی و دوو سروشتی زمانی ئەسیتینی ، وە نرخێکی زۆر بەو بۆچوونە دەدات . لەم بارەیەوە ب ف. میللیر نووسیویەتی : « بێ‌گومان ، ئەم جۆرە نووسینانە نرخێکی زۆریان هەیە بۆ لێکۆڵینەوە لە زمانە ئێرانیێکان و بۆ نیشاندانی تێکەڵاوی یەکێك لە هەرە زمانە کۆنەکانی ئەمڕۆی زمانە زیندووەکانی ئێران. زمانناسان پێویستە لە لێکۆڵینەوەکانیاندا ، بێنە سەر ئەم رێگایە ... »[44]

ب ف. میللیر بە تەواوی سنووری لێکۆڵینەوەی لە تێکەڵاوی زمانە ئێرانیێکان نەکێشاوە . ئەو نیشانی پێویستی لێکۆڵینەوەی

---

(٤٢) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٩٤ .

(٤٣) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٩٥ .

(٤٤) نامەی زانایانی زانکۆی مۆسکۆ ، ب ٣ ، ز ١٠٧ ، ل ٧٨ ، ١٩٤٦ .

دەورە جیاوازەکانی زمانە ئێرانیەکان دەدا و دەیەوێ کە لێکۆڵینەوە لە زمانە ئێرانیەکان لەگەڵ چۆنێتی پێشکەوتنی زماندا پەیوەندی هەبێ لەم بارەیەوە نوسیویەتی : لە تەمەشاکردنی مەسەلەی جیاوازی شێوەی حاڵەتی راستەوخۆ و حاڵەتی تەواندی ( oblique case ) لە زمانە زیندوە ئێرانیەکاندا « وینەیەکی زۆر سەیر لە دابەش کردنی حاڵەتی راستەوخۆ و حاڵەتی تەواندیدا ( بۆ هەردوو ناوی تاك و کۆ ) دەردەکەوێ ، وە نیشانی دەورەکانی جیاوازی دیالێکتە وێکچوەکانی زمان و مەسەلەیەکی زۆر گران دەدات . ئەمە ئێمە دەخاتە بیرێکی قوڵەوە ، کە لێکۆڵینەوە لە زمانە ئێرانیەکان پێویستە لە رێگایەکی گشتییەوە بێت لە پێشکەوتنی زمان »[٤٥] .

ئەو لە ناو هەمو زمانە هیندو ئەوروپاییەکاندا لێکۆڵینەوەی زمانە ئێرانیەکانی بە دواکەوتوترین لێکۆڵینەوە دادەنا ، ئەویش تەنها لەبەر ئەرەی کە لێکۆڵینەوە لەسەر شێوەی بەرامبەرکردنی مێژوویی لای نەدا . ئەو دەڵێ : « هەتا لێکۆڵینەوە لە زمانە ئێرانیەکان لەسەر ئەو رێگایەی هەردەم لەسەری رۆیشتوون ( واتە بە زمانێکی هیند و ئەوروپایی دانە قەڵەم ) لانەدا و نەیەتە سەر رێگایەك کە لەسەر بنچینەیەکی کۆمەڵایەتی بێت ، ئەوە ئەو زانستە بێ بەرهەم دەبێت »[٤٦] .

سەبارەت پاشماوەی یافیەتی لە زمانە ئێرانیەکاندا لە وتاری « ئامرازی کۆ ( ئان ) لە زمانە ئێرانیەکاندا » نوسیویەتی : « شکی

---

(٤٥) ئەکادیمیەی زانستی سۆڤیەت بۆ ئەکادیمی ن. یا. مارر ، ل ٣٠٦ ،

(٤٦) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٩٣ ـ ٢٩٤ .

تیدانییە ، کە لە ڕێگای زمانە هینــد و ئەوروپاییەکانەوە هیــچ ڕوون کردنەوەیەکیان دەســت ناکەوێ »[47] « تەنهـــا لە ڕێگای لێکۆڵینەوەی نوێ دربارەی زمـــان دەتوانین بگەینە ئەنجـــام و خاوکردنەوەی گەلێك شتی ئاڵۆز »[48] .

ب ف میللیر نزیکەی لە هەمو وتارەکانیدا هەوڵی ئەوەی داوە کە نیشانی بدا لە زمانە ئێرانیەکاندا لە فۆنێتیك و مۆرفۆلۆژیدا پاشماوەی یافیتی هەیە ، وە بە باوەڕی ئەو نەتەوە ئێرانیەکان تێکەڵاون و لە یافیتی و ئێرانی دروست بوون .

لە وتاری « تێکەڵاوی زمانە ئێرانیەکان » دا نوسیویەتی دەڵێ : « لە زمانە ئێرانیەکاندا وەئەبێ کەم پاشماوەی یافیتی هەبێ کە دەگەڕێتەوە بۆ دەوری کۆنیان »[49] .

ئەوەی ئەو ناوی دەنێ پاشماوەی یافیتی و لە سەر ڕێگای « لێکۆڵینەوەی نوێ دەربارەی زمان » لێی دەکۆڵێتەوە و ئەوەی بۆ نیشاندانی پاشماوەی یافیتی لە زمانە ئێرانیەکاندا وتویە لە ڕاستی مێژووەوە دوورە . لێرەدا دەردەکەوێ کە نوسەر لەو بەڵگانەی مێژوو دەربارەی زمانە ئێرانیەکان نیشانی دەدا سودی وەرنەگرتووە ، بەڵکو چووە سودی لە مێژووی یافیتی و لە بیر و باوەڕە چەوتەکەی ن. یا. مارر وەرگرتووە . لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە ،

(٤٧) بیرەوەری ئەکادیمی ن یا. مارر ، ١٩٣٨ ، ل ١٩٣ .

(٤٨) هەمان سەرچاوە .

(٤٩) ئەکادیمیەی زانستی سۆڤیت بۆ ئەکادیمی ن. یا. مارر ، ل ٢٩٧ .

ئەو تیۆرییەی کـە ن. یا. مـــارر لە لیڤی - بریولیای وەرگرتووە ، ب. ف. میللیریش یەکسەر دەیەوی بەسـەر زمانی ئەمڕۆی فارسـتی و تاجیکتی و کوردتی و ئەفغانتیدا بیچەسپێنێ ، کە ئەمە بە هیـــچ جۆریك ناشێت .

ب. ف. میلـلـیر دەڵێ ، هۆی جیا نەکردنەوەی چەند حاڵەتێـکی ( Voice ) - ( صیغه المعلوم والمجهول ) لە هەندێ لە زمـانە ئێرانێکانی ئەمڕۆدا ئەوەیە ، کە پاشماوەی یافیتتییان هەیـە و زمـــانی کۆنی خۆیان بیرنەماوە . بۆ نموونەش ۱۵ کردار ( فعل )ی هێناوەتەوە ... ئەو نوسیویێتی : « لە تێکـەڵاوکردنی ئەم ( Voice ) دا پاشماوەی کۆن باش دەردەکەوێ . . . . . » (۵۰)

هـــەر لەبەر جیانەکردنەوەی چەند حاڵەتێکی Voice لە زمانە ئێرانێـکانی ئێـــستادا ب. ف. میللـیر دەڵێ پاشماوەی یافیتتی لـەو زمانانەدا هەیە . ئەمە شتێکی راست نییەو بە بەڵـگەش ناژمێررێت ، کە زمانە ئێرانێـکان لە زوودا یافیتتی بوون و ئێـتا تێکەڵاون . بەڵـکو ئەمە ئەنجامی تێپەڕبوونی ماوەیەکی درێژ و پێشکەوتنێکە لەم زامانانەدا ، کە هەندێ پێشـگر و پاشگر لەسەر زمان کەوتوون ، وە ئەمەش لە بەراوردکردنی رێزمانی زمانە ئێرانێـکاندا دەردەکەوێ .

ب. ف. میللیر لە نوسـینەکانیدا بۆ چاسپاندنی ئەو باوەڕەی ( کە گوایا پاشماوەی یفیتتی لـــە زمانە ئێرانێـکاندا هەیـە ) زوربەی

---

(۵۰) ب. ف. میللر ، تێکـەڵاوتی زمانە ئێرانیـکان ، « ئەکادیمیەی زانستی سۆڤێت بۆ ئەکادیمی ن. یا. مارر » ، ل ۲۹۹ .

بەڵگەکانی ئەوەیە کە دەڵێ ن. یا مارر دەربارەی ئەم مەسەلەیە وای نوسیوە. بەڵام ئەم بەڵگانە لە جێگای خۆیانانین و لە ڕێگایەکی راستی زانستییەوە نیشان نەدراون ، وە لە بەردەم رەخنـەدا خۆیان ناگرن و دەڕوخێن .

بـــەم بۆ نەیەوە تەماشایەکی لێکۆڵینەوەکانی ب. ف. میللیر دەکەین .

ن. یا. مارر لە لێکۆڵینەوەکانیدا ئەوەی بۆی روَن نەبوەوە و لێی ئاشـکرا نەبو بە یافیتی دایە قەڵەم و ئنجا لە پاشـــا هاتـە سەر لێکۆڵینەوەی مانا لە چوار رێگاوە. ب ف میللیریش هەر بەو شێوەیە کۆڵیوەتەوە .

لەسەر رێگای « لێکۆڵینەوەی نوێ دەربارەی زمان » . ب. ف. میللیر بۆ پەیدابونی تاك و کۆ نوسیویتی : لـە زمانە ئێرانیـکاندا « هەردەم بەکار هێنانی کۆ بۆ کۆمەڵێکی یەكگرتو لە کاردایـە ، کە لەگەڵ بیری کۆندا دەگونجێ . .. بەتایبەتی ئـەم جـۆرە بـەکار هێنانە لە زمانی کوردیدا دەبینرێ . لە زمانی کوردیدا هەندێ وشە هەن کە لە یەك کاتدا ، هـەر بەو شـــێوەیە بۆ ( کۆ )ش و بۆ ( تاك )یش بـەکار دەهێنرێن ، وەك : زار ، کوڕ ، پەز ، خانی ، حەیوان ، .... هتد . بۆ نمونە : حەیوانی جۆلی ئەڤن ؛ مەدی خانی یە بلند و مەزن »[٥١]

گەر بیری کورد قوڵ نییـــە و کۆنە ، گەر کورد ناتوانن

---

(٥١) ئەکادیمیەی زانستی سۆڤێت بۆ ئەکادیمی ن. یا مارر ، ل ٣٠٦ .

جیاوازی لەنیوان تاك و كۆدا بكەن ، ئەی بۆچی ب. ف. میللیر ئەو نموونانەی هێناویەتەوە تەنها بۆ كۆ وەری گێڕاوەتە سەر زمانی رۆستی ، ئەی بۆچ هەروەها بو تاك وەری نەگێڕاوە ؟.....

لە وتاری « هەندێ چەڵەمەی فۆنێتیكی زمانی كوردتی »دا ب. ف. میللیر دەیەوی نیشانی بدات كە فۆنێتیكی زمانی كوردتی ، وەك فۆنێتیكی زمانە یافیتیەكانە ئەو وا دەداتە قەڵەم كە هەندێ دەنگ لە زۆدا ناقۆلا بوون ، بەلام كە بە دەوری یافیتیدا تێپەرین چاك بوون ، یا وەك ئەو دەڵێ « فراوان بوون » . ئەو نووسیویتی : « گەر لە دەنگی ( ع ) و ( غ )ی عەرەبیدا وێكچوونێك لە نیوان زمانی كوردتی و زمانە سامیەكاندا هەبێت ، ئەوە پەیوەندییەكی پتر لە سێ دەنگی گرنگدا لە نیوان زمانی كوردتی و زمانە یافیتیەكاندا هەیە . ... »[52] .

دەربارەی چۆنیتی ( تلفظ ) كردنی ( ع ) و ( غ ) لە زمانی كوردیدا نووسیویتی : « لە رۆی ( تلفظ )دوە ئەم دۆ دەنگە خاوەنی خاسیەتی تایبەتی خۆیانن ، كە زۆر دوورن لە زمانە هیند و ئەوروپاییەكان . باشتر وایە رۆن بكرێتەوە كە ئەمە هۆی ئێكەلاوتی ئەم زمانەیە ( زمانی كوردتی - وەرگێڕ ) لەگەڵ زمانانی تردا »[53] .

بە گوێرەی باسەكانی ب. ف. میللیر ، وا دەركەوێ كە كورد كۆن یافیتی بوون و لە پاشا بوون بە یەكێك لە زمانە ئێرانیەكان ، وە

---

(٥٢) زمانە ئیرانیەكان ، ب ٢ ، ل ٦٩ - ٧٠ ، ١٩٥٠ .

(٥٣) هەمان سەرچاوە ، ل ٦٢ .

فۆنێتیکی هەندێ گۆڕرا . لە فۆنێتیکیدا تا رادەیەك شێوەی کۆنی تێدا ماوە . هەروەها بە باسەکانیدا وا دەردەکەوێ کە فۆنێتیك گرنگتر بێ لە دروست بونی رێزمان و تێکزایی وشەکانی زمان .

با بڵێین ئەو ئەنجامە ناڕاستانەی نوسەر راستن ، کە دەڵێ کورد بە رەگەز یافیتییە و دوایی زمانی ئێرانییان وەرگرت ، وە لەبەر ئەوەی بە درێژایی مێژو تێکەڵاوییان لەگەڵ میللەتەکانی قەفقاسدا هەبو ، هەندێ شێوەی فۆنێتیکی یافیتی مایەوە .

گەر ئەمە راست بێت ، ئەی زمانی ئەفغانی و پامیر دەبێ چون بێ ، کە فۆنێتیکیان زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ فۆنێتیکی زمانەکانی هیند و ئەوروپاییدا ؟ . زۆر هەڵەیە کە خەیاڵی وەها بکرێ ، بە تایبەتی بۆ زمانی ئەفغانی و پامیر کە ئەم میللەتانە نە بە مێژو ، نە بە سنور ، نە بە تێکەڵاوی هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵ میللەتەکانی قەفقاسدا نەبوە . ئەی وەڵام چییە بۆ ئەوەی کە فۆنێتیکی ئەم نەتەوە ئێرانیانە (ئەفغان و پامیر — وەرگێڕ ) لەگەڵ فۆنێتیکی زمانی کوردیدا ئێجگار زۆر وێکدەچن ، لەگەڵ ئەوەی لە تەنیشت ئەم نەتەوانەوە یافیتی نەژیاون و نازین تا بتوانن تاسیر بکەنە سەر فۆنێتیکیان .

ئەی بۆچی نەتوانین بە پێچەوانەوە بڵێین ، کە دەنگەکانی زمانی کوردی و ئەفغانی و پامیر لە ناو خۆیاندا پەیدا بوون و لەگەڵ یافیتیدا هیچ پەیوەندییەکیان نییە . ئەگەر لە نیوان ئەم زمانانەدا ، کە لە یەك گروپن جیاوازی و وێکچون لە فۆنێتیك و دروست بونی رێزمان و وشەکانیاندا هەبێت ، ئەوە بۆ رون کردنەوەی ئەو وێکچون و جیاوازییە پێویستە لە سەرمان لە ناو

ئەم زمانانەدا ( واتە لەناو خۆیاندا ) بگەڕێین بۆ دۆزینەوەیان ، نەك لەناو زمانانی گروپێـکی کەدا .

بەم جۆرە لێـکۆڵینـــەوەکەی ب. ف. میللەر کە لە زمانانی کوردی و ئەفغانی و پامیردا بۆخاسیەتی فۆنێتیکی یافینی دەگەڕێ لە جێـگای خۆیدا نییە و لاوازە .

پێویستە ئەوەش بڵێین ، کە بەشە دیالێـکتەکان و دیالێـکتەکانی کوردی بۆ ب. ف. میللەر ڕوَن نییە .

لە وتاری « زمانی کوردی »[٥٤] دا بۆ بەشـــە دیالێـکتەکانی خوارۆی ڕۆژهەلاتی ناوچەکانی ( زەنـگەنە و کەلهور و کرمانشـا و سنە ) کە لە زمانەوانیدا لە ژێر ناوی ( کورد ) دا ئاشکرا و ناسراون ، کەچی ئەو وەك گروپێـکی تایبـەتی جیایان دەکاتەوە و ناویان دەنێ « دیالێـکتەکانی کوردی — فارسی » . نازانین لەسەر چی بەڵـگە و بنچینـــەیەك ئەو ئەمەی کردوە . بەشە دیالێـکتەکانی خوارۆی ڕۆژهەلات کردن بە گروپی « دیالیـکتەکانی کوردی — فارسی » باوەڕێـکی وەها دروسـت دەکا کە گوایا جیاکردنەوەی ئەم دوَ زمانە ( کوردی و فارسی — وەرگێز ) گرانە . ناونانی ئەم بەشە دیالێکتانەی کوردی بەو شێوەیە ، نەشـارەزایی ب ف. میللەر نیشان دەدات لە جیاکردنەوەی دیالێکت و بەشە دیالێـکتەکانی کوردیدا .

ئەم نەشارەزاییەی ب ف میللەر لە وتـــاری « ئامرازی کۆ

---

(٥٤) ڕوانە : ئینسکلۆپیدیای ئەدەبی ، ١٩٣١ ؛ هـەروەها ئینـکلۆپیدیای لەورەی سۆڤیتی ، ١٩٣٥ .

( ئان ) لە زمانە ئێرانیێکاندا » دەردەکەوێ . لەم وتارەدا بەشە دیالێکتە کوردیێکانی ناوچەکانی ( موکریێ و سـلیمانێ و جەزیرە وزاخو و بادینانی ) ناو ناوە دیالێکتەکان . ئەو نوسیویێ : « لە زوربەی دیالێکتەکانی کوردێ ( موکریێ ، سلیمانێ ، جەزیرە ، زاخو ، بادینان و لە زمانی کوردانی سۆڤیێت ) دا . . . ئامرازی ( ئـان ) زۆر بەکار دەهێنرێ . . . »[٥٥] . کەچی ، هەر لە لاپەرەی ئـەو دیوی ئـەم وتارەدا و هەروەها لە وتـاری « تێکەڵاوێ زمانە ئێرانیێکاندا » ناوناوە بەشە دیالێکتەکانی زمانی کوردێ ، لە وتاری « هەندێ چەڵەمەی زمانی کوردێ » دا ، سلیمانێ ناوناوە « بەشە دیالێکتێکی سەربەخۆی زمانی کوردێ ، یاخود بەشە دیالێکتێکی گروپی خوارۆی زمانی کوردێ »[٥٦] . لە وتاری « کارەکانی زانایانی روس دەربارەی زمانە ئێرانیێکان » دا دەڵێ : « سلیمانێ بەشێکە لە دیالێکتی کرمانجێ ژوورۆ »[٥٧] .

زۆر جار لە ناوی ئەو هەرێمانەی کە کوردی تیدایە و لە ناوی جیاوازی ئەو خێڵە کوردانەی کە بە یەك دیالێکت و بە یەك بەشە دیالێکت دەدرێن ناو دەنێ دیالێکت و بەشە دیالێکتی جیاواز . بۆ نموونە ، بەشە دیالێکتی ناوچەکانی دیاربەکر و بادینان ناو دەنێ دیالێکتەکانی بادینان و دیاربەکر . بەشـە دیالێکتی ئـەم خێڵانە :

---

(٥٥) بیرەوەری ئەکادیمی ن. یا. مارر ، ل ١٩٠ .

(٥٦) زمانە ئێرانیێکان ، ب ٢ ، ل ٦٣ ، ٧٦ .

(٥٧) نامەی زانایانی زانکۆی مۆسکۆ ، ب ٣ ، ژ ١٠٧ ، ل ٧٦ ، ١٩٤٦ .

( بروکێ ، شەرکێ ، جەلالی ) کە خاوەنی یەك بەشە دیالێکتن ، ئەو بەسەر چەند بەشە دیالێکتێکدا دابەشیان دەکات و ناویان دەنێ بەشە دیالێکتەکانی ( موش ، بروکێ ، شەرکێ ، جەلالی . . . )[٥٨] .

ئەم نانەواویانە ، ئەوە نیشان دەدەن کە ب. ف. میللیر لە جیاکردنەوەی دیالێکت و بەشە دیالێکتدا شارەزاییەکی تەواوی نەبووە ، لەبەر ئەو هۆیەیە کە زۆر جار بە دیالێکت دەڵێ بەشە دیالێکت ، وە بە بەشە دیالێکت دەڵێ دیالێکت . هەندێ جار یەك دیالێکتی کوردی بەسەر چەند دیالێکتێکدا دابەش دەکات ، وە دوایی هەر ئەو دیالێکتە بەسەر چەند بەشە دیالێکتێکدا دابەش دەکا . جگە لەوە زۆر جار دیالێکتێك یا بەشە دیالێکتێك ، کە هەر یەکێکن بەسەر دیالێکت و بەشە دیالێکتی جیاوازدا دابەش دەکا و ناوی ناوچەیان لێ دەنێ ، لەگەڵ ئەوەی دانیشتوانی ئەو ناوچانە بەیەك دیالێکت دەدوێن .

جگە لەوە دەبینین لە چۆنێتی دروست بوونی زمانی کوردیدا ب. ف. میللیر بە بەراوردکردنی زمانی کوردی لەگەڵ ئەو زمانە ئێرانیانەی کە لەیەك خێزانی زمانن گرنگی نەداوە . نە لە بارەی وشەکانی زمانەوە بەگشتی ، نە لە فۆنێتیك . . . هتد هیچ بەراوردێکی نەکردوە .

بۆ ئاشکراکردنی بیر و باوەڕە چەوتەکانی ب. ف میللیر لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا ئەو نموونانەی سەرەوە بەسە . پێویستە

---

(٥٨) زمانە ئێرانیکان ، ب ٢ ، ل ٦٦ .

ئەوەش لە بیرنەکەین کە هەمو ئەو باسانەی سەرەوەی ب. ف. میللیر لە سەر لێکۆلینەوەی ۲۰۰ وشە و ۲۰ رستەیەکی پچڕ پچڕ بو کە لە هەندێ فەرهەنگ و کتێبی رێزمان وەری گرتووە.

بەم چەشنە، ب. ف. میللیر بە هەمو جۆرێك دەیویست تیۆرێکەی ن. یا. مارر بچەسپێنێ و بێ بەلگە زمانی کوردی بە زمانێکی تێکەلاو لە یافیتی وئێرانی دابنێ.

لە لێکدانەوەی باسەکانی ب. ف. میللیردا دەرکەوت چۆن ئەو دەیویست نیشانی بدا کە لە زمانە ئێرانیێکاندا پاشماوەی یافیتی هەیە و کە زمانە ئێرانیێکان تێکەلاون ... ئەم نیشاندانەی ئەو لە رێگای تیۆرییە دوَر لە زانستییە، دژی مێژوَییەکەی ن یا. ماررەوە بو. لە سالی ۱۹۵۳ دا ب. ف. میللیر کتێبێکی نوێی لە ژیر ناوی «زمانی تالیشی» دا دەرکرد. بەداخەوە نوسەر نەك بە پێویستی نەزانیوە لەم کتێبەیدا پێ لە هەلەکانی پێشوی بنێ، بەلکو بە پێچەوانەوە دوَبارەی کردەونەتەوە. چوەوە رەگەزی تالیشی بە یافیتی داناوە و دوایی بەرەو ئێرانی بردوە.

لە مانگی شوباتی سالی ۱۹۲۵ دا لە کۆبونەوەیەکدا کە لە نیوان بەشی ئێرانی — قەفقاسی ئامۆژگای زمانەوانی و بەشی ئێرانی ئامۆژگای رۆژهەلاتناسیدا کرا بۆ لێکۆلینەوە لە دانانی فەرهەنگێکی کوردی — روَسی (دیالێکتی کرمانجی ژوَروَ)، ئەو لەبەر روَشنایی نوسراوەکانی ن. یا. مارر و ئو. ل. ڤیلچێڤسکیدا وتی: نەك هەر پێویست نییە فەرهەنگێکی کرمانجی ژوَروَ دابنرێ،

بەڵکو ئەم کارە ناتوانرێ بەجێ بهێنرێ ، ئەویش لەبەر ئەوەی کورد دابەش کراون ، خاوەنی یەك جۆر نوسین نین و لە وەرگرتنی وشەی بێگانەدا جیاوازییان هەیە ....

بەڵام دەبێ ئەوە لەبیر نەکەین کە گرنگی زمان لە چۆنێتی رێزمان و وشەکانی زماندایە بەگشتی . ئیتر سنوریکی دەستکرد نابێ بە تەگەرە و نابێ بە هۆی جیاوازییەکی گەورە لە زماندا و لە نوسین و لە وەرگرتنی وشەی بێگانەدا . نەبونی یەك جۆر نوسین و یەك سەرچاوە بۆ وەرگرتنی وشەی بێگانە لە زمانی کوردیی (کرمانجیی ژوورو) دا لە سوریا و تورکیا و ئێران و عێراق و یەکێتی سۆڤێت ناتوانن ببن بە هۆ و تەگەرە لە رێگای دانانی فەرهەنگی کوردیی — رۆسیدا . خۆ نوسین و وشەی بێگانە زمان ناگۆڕن و رێزمان و وشەکانی زمان تێكنادەن . وەنەبێ دەوڵەمەندیی زمانی کوردیی بە هۆی وشەی بێگانەوە بێت ، بەڵکو بە هۆی دروست بونی ناوخۆی خۆیەتی ، کە سنوری دەستکرد پەیوەندیی نییە .

ب. ف. میللەر گرنگی نادات بەشتی سەرەکیی وەك : رێزمان و وشەکانی زمان بەگشتی و چۆنێتی ناوخۆی وشەکان ، بەڵکو گرنگی بە هەندێ شتی دوور و لابەلا داوە ، وەك : وشەی بێگانە و تێکەڵاوی .

— — —

لەبەر رۆشنایی ئەم باسەدا ، باش ئاشکرایە کە لەسەر کوردناسان چی پێویستە بکەن و چی رێگایەك بگرن . کوردناسانی سۆڤێت

دەربارەی زمانەوانی چ لە تیۆری و چ لە پراکتیك دەتوانن گەلێك کاری ئاڵۆز خاو بکەنەوە . بەڵام بەر لە هەمو شتێك لەسەر شایانە ئەو تیۆرییە چەوتانە ، دوَر لە زانستییانەی دەربارەی زمان و ئەدەب و مێژوَ و ئەتنۆگرافیای کورد هەن بەدرۆ بخەینەوە و لە ناویان بەرین . دوَر کەوتنەوە لە بیر و باوەڕی ناڕاستی ن . یا . مارر و لایەنگیرانی ، رێـگا تەخت دەکا بۆ کوردناسانی سۆڤێت هەتا بتوانن بە رێگایەکی سەربەخۆی پێشکەوتودا برۆن ، وە شوێنێکی بەرز لەکاری زمانەوانی سۆڤێت و زانستی رۆژهەڵاتناسیدا وەربگرن .

لەسەر کوردناسانی سۆڤێت پێویستە گرنـگی بدەن بە :

١ — لێـکۆڵینەوە لە مێژوی پێشکەوتنی زمانی کوردی .

٢— لێـکۆڵینەوە لە مێژوی پێشکەوتن و دروسـت بونی نەتەوەی کورد .

بۆ بەجێهێنـــانی ئەم پێویـستیانە دەبێ گرنـگی بدرێ بەو یاسـایانەی لە ناو زمانی کوردیدا هەن . دەبێ لێـکۆڵینەوە لە زمانی کوردی لەبەر رۆشنایی (فۆنێتیك و مۆرفۆلۆژی و وشە بەگشتی و سینتەکسیس )دا بێ ، چونـکە یاسای ناوخۆی زمان لەم بە شانەدا (فۆنێتیك و مۆرفۆلۆژی و .... ) کە پێـکەوە بە سـتراون دەردەکەوێ .

بەم بۆنەیەوە یەکەم پێویستی ســـەرشانی کوردناسانی سۆڤێت ئەوەیە : لێـکۆڵینەوە لە رێزمان ، لە وشەکانی زمانی کوردی ، نوسینی گەلێك کتێبی تیۆری و پراکتیکی رێزمان .

هەندێ پێویستی تر هەیە کە پەیوەندییەکی زۆریان هەیە لەگەڵ ئەو پێویستیانەی لەسەرەوە باسمان کردن لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا ، ئەوەش لێکۆڵینەوەیە لە ئەدەبی کوردیی کە مێژووی نزیکەی هەزار ساڵ دەبێت . لە سەدەی ۱۱ تا ۱۸ لە ئەدەبی کوردیدا گەلێك شاعر و نوسەر هەن ، کە بەرهەمەکانیان نەك تەنها بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی کولتوری میللەتی کورد بەنرخن ، بەڵکو هەروەها بو لێکۆڵینەوەی مێژووی پێشکەوتنی زمانی کوردیی بایەخ و نرخی تایبەتییان هەیە .

بەم بۆنەیەوە پێویستە لە سامانی دەوڵەمەندی فۆلکلۆری کوردیی بکۆڵرێتەوە ، کە کەرەستەیەکی گرنگە بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی پێشکەوتنی زمانی کوردیی مەسەلەی لێکۆڵینەوە لە زمانی گفتوگۆ و لە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو زۆر پێکەوە بەستراون . ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە رێگا خۆش دەکەن بۆ دروست بوونی زمانی ئەدەبیی کوردیی .

هەروەها لەسەر شانی ئێمەی کوردناسانە کە گەلێك لێکۆڵینەوەی گرنگ و پێویست پێشکەش بکەین ، وەك : لێکۆڵینەوە لە رێزمانی کوردیی و بەراوردکردنی هەردوو دیالێکتی ( کرمانجیی ژوورو و کرمانجیی خوارو ) ، دانانی گەلێك فەرهەنگ ، وەك : ۱) کوردیی - روسیی (دیالێکتی کرمانجیی ژوورو ) ، ۲) کوردیی - روسیی ( دیالێکتی کرمانجیی خوارو ) ، ۳) فەرهەنگی گەورەی کوردیی - روسی ( هەردوو دیالێکت ) .

بۆ هێنانەدی ئەم پێویستیانە کوردناسانی سۆڤێت لە رێگای

ڕەخنەوە سوود لە لە کەرەستەی دەوڵەمەندی کوردناسە بۆرجوازیەکان وەردەگرن .

ڕوون کردنەوەی مێژووی پێشکەوتنی دیالێکتەکانی کوردی ، لێکۆڵینەوە لە جیاوازی و وێکچوونیان لە فۆنێتیك و ڕێزمان و وشە .... پێویستیەکی گرنگی سەرشانی کوردناسانی سۆڤێتە .

بەجێهێنانی ئەم پێویستیانە شتێکی زۆر گرنگە بۆ گەیشتنە ئەنجام دەربارەی ئەو نائاشکراییەی لە مەسەلەی دیالێکتەکانی کوردیدا هەیە ، وە لە پەیوەندییاندا لەگەڵ زمانە ئێرانیەکانی تردا کە لە یەك خێزانی زمانن . ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە نەك تەنها یارمەتی ڕوون کردنەوەی جیاوازی و وێکچوونی دیالێکتەکانی کوردی دەدەن ، بەڵکو یارمەتی ڕوونکردنەوەی یاسای ناوخۆی چۆنێتی پێشکەوتنی زمانی کوردیش دەدەن بەگشتی ، هەروەها یاریدەدەرن بۆ گەیشتنە ئەنجام دەربارەی چۆنێتی مێژووی دروست بوونی زمانی نەتەوایەتی کورد . ئاشکرایە ، کە «لە کاتێکدا دەتوانین لە زمان و یاسای پێشکەوتنێ تێبگەین ، گەر لێکۆڵینەوەکە لە ڕێگای پەیوەندییەکی هەمیشەییەوە بێت لەگەڵ مێژووی کۆمەڵدا ، لەگەڵ مێژووی گەلدا ، کە ئەو کۆمەڵ و گەلە خاوەن و دروستکەر و هەڵگری ئەو زمانەن کە لێی دەکۆڵرێتەوە »[٥٩] .

* * * *

(٥٩) یوسف ستالین ، مارکسیزم و مەسەلەی زمانەوانی ، ل ٢٢ .

# شی‌کردنەوەی بەڵگەکانی کەزنەفۆن دەربارەی کاردوخەکان[١]

لە نوسراوەکەی «ئاناباسیس»ی کەزنەفۆندا دەربارەی کاردوخەکان ، کە وڵاتەکەیان لە باشورەوە ، هەر لە دەریاچەی وان و ناوچە شاخاوییەکانی هەکارییەوە تا باکوری روباری دیجلە لە رۆژئاوادا کشابو گەلێك بەڵگەی بەکەڵك هەیە .

لەسەر ئەو باوەڕەی کە خاکی کوردستانی ئێستا هەر ئەو خاکەیە کە لە کاتی خۆیدا کاردوخەکانی تێیدا ژیاون ؛ لە رێگای لێك‌چونی خو و رەوشت و شێوەی زمانی کورد و کاردوخ ، بە هۆی یەك مانایی وشەی ( کاردۆخ ، کوردیك ، کۆرد ، کورد ) و پەیوەندی ئەتنۆگرافی لە نێوانیاندا ، زۆر لە زانایان هاتونە سەر ئەو باوەڕەی ،

---

(١) کورتەی ئەم وتارە لە ژێر ناوی (تێبینی لە لێکدانەوەیێکی زانیاریەکانی کەزنەفۆن لە بابەت کاردوخەکانەوە ) ، لە لایەن د. مارف خەزنەدارەوە کراوە بە کوردی و لە ژمارەی (١)ی «دەفتەری کوردەواری»دا بلاوکراوەتەوە ، ل ١٢١ ــ ١٢٦ . بێ‌گومان ، د. خەزنەدار کارێکی گەورە و پێویستی بەجێ هێناوە ، بەڵام لەبەر گرنگی ئەم وتارە بە پێویستمان زانی کە مامۆستا ق. کوردۆ چۆن نوسیویێتی هەر بەو شێوەیە بیکەین بە کوردی .

کە وا کاردوخەکان یەکێك بوون لە نەتەوەکانی خێزانی زمانە ئێرانیەکان و هەروەها ئەم نەتەوەی کوردەی کە ئێستا بە یەکێك لە پەلی رۆژئاوای زمانە ئێرانیەکان دەدوێ نەوەی راستەوخۆی کاردوخەکانن ئەم راستیەش بە ئاشکرا رونکراوەتەوە و لە لایەن زانا کوردەکان[2] و فارس[3] و ئەوروپاییەکانەوە[4] چەسپێنراوە . هەندێك لە زانایان لەو بڕوایەدان کە گوایە کاردوخەکان لە رووی زمانەوە نەتەوەیەکی ئێرانی نەبوون ، بەڵکو زمانیان زمانێکی ناوچەییە و پەیوەندی بەزمانە ئێرانیەکانەوە نییە . ئەم باوەڕە بۆ یەکەم جار ن. یا. مارر بڵاوی کردەوە . ن. یا. مارر لە نوسراوەکەی « دیان دەربارەی وشەی چەلەبی »دا هەوڵی داوە بیچەسپێنێ کە نەژادی کورد یافیتیە و بەو بۆنەیەوە باسی دەورەکانی پێشکەوتنی زمانی کوردی کردوە[5] .

---

(٢) ئەمین زەکی ، خولاصەی تاریخی کورد و کوردستان ، بەغداد ١٩٣٦ ( بە زمانی عەرەبی ) ؛ هەروەها عەلائەدین سەجادی ، مێژوی ئەدەبی کوردی ، بەغداد ١٩٥٢ ، ( بە زمانی کوردی ) ، ل ٢٣ ـ ٢٦ .

(٣) رەشید یاسمی ، مێژوی نەژاد و پەیوەستەگی کورد ، تاران ، ( بە زمانی فارسی ) ، ل ١٠٠ ـ ١١٢ ، ١٤٨ ـ ١٥٧ .

(٤) ف. نیکیتین « کورد » ، مۆسکۆ ١٩٦٤ ، ل ٤٦ ـ ٥٢ ( بە زمانی روسی ) ؛ هەروەها ی. ب. سۆن ، گەشتێکی نهێنی لە میسۆپوتامیا و کوردستاندا ، لەندەن ١٩٢٢ ، ل ٣٦٩ ـ ٣٧١ ( بە زمانی ئینگلیزی ) .

(٥) ن. یا. مارر ، دیان دەربارەی وشەی چەلەبی ، « دەستنوسەکانی بەشی رۆژهەلاتناسی کۆمەڵی ئارخیۆلۆژی » بەرگ ٢٠ ، پیترسبورگ ١٩١٢ ، ل ٨٩ ـ ١٥١ .

دوا بەدوای ن. یا. مارر ، ئو. ل. ڤیلچێڤسکی[٦] و ب. ف. میللیر[٧] تەشەنەیان بەم تیۆرییە داوە و ویستویانە ئەو باوەڕە بچەسپێنن کە کورد دادەنێ بەوەی کە لە ئەنجامی تێکەڵاوبونی چەند نەتەوەیەکی جیاواز پەیدابوە. ئەم تیۆرییەی ن. یا. مارر کاری کردە سەر (گ. ب. ئاکۆپۆف)یش. لە وتاری «چەند وشەیەك دەربارەی مێژوی زمانی کوردی»[٨] کە لە ساڵی ١٩٦٨دا بڵاوی کردەوە ، نوسەر دوپاتی ئەو باوەڕە چەوتە ، ناڕاستە ، هەڵانە دەکاتەوە کە زۆ دەربارەی رەگەزی کورد و زمانی کوردی و پێشکەوتنی هەبون و کە ئەو جۆرە باوەڕانە لە مێژە لە لایەن کوردناسەکانەوە لەناو براون. ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە گ. ب. ئاکۆپۆف شارەزای زمانی کوردی نییە ، چۆنێتی دروست‌بونی رێزمانی نازانێ ، شارەزای وشەکان و مێژوی پێشکەوتنی ئەدەبی کوردی نییە ، کەچی هەوڵی داوە نیشانی دەورەکانی پێشکەوتنی زمانی کوردی بدات. لە ئەنجامەکانی ئەم وتارەدا نوسیویێتی : «ئەمە هەموی یارمەتیمان دەدات کە بتوانین نەخشەی دەورەکانی زمانی کوردی بکێشین و بەتەواوی ئەو دەورانە ئاشکرابن : دەوری کۆن — لە یەکەم جاردا ، واتە لە زۆدا زمانی

(٦) ئو. ل. ڤیلچێڤسکی ، ن. یا. مارر و کوردناسی ، «زمان و بیر» ، بەرگ ٨ ، لینینگراد ١٩٣٧ ، ل ٢٠١ – ٢٣٣ .

(٧) ب. ف. میللیر ، دەربارەی دەورەکانی زمانە ئێرانیەکان ، «ئەکادیمیەی زانستی سۆڤێت بۆ ئەکادیمی ن. یا. مارر» ، مۆسکۆ ١٩٣٦ ، ل ٩٧ – ١٠٢ .

(٨) رۆژنامەی «ریا تازە» ، ئەیلول ١٩٦٨ ، ژمارە ٧٨ .

کوردی لە پەلی ئێرانی نەبو . دەوری دووەم — لەم دەورەدا زمانی دانیشتوانی کوردستان بو بە زمانێکی ئێرانی . دەوری سێیەم — لەم دەورەدا کورد بو بە کۆمەڵێکی جیاوازی تایبەتی و زمانی کوردی دروست بــو . دوا کاتی دروست بونی زمانی کوردی لە کۆتایی ساڵانی هەزاری پ. زاییندا بو کە لەزانستدا چەســپاوە . دەوری نوێ — ئەو دەورەیە کە لەســەر بناغەی دیالێکتی کرمانجی (واتە کرمانجی ژورو — وەرگێڕ ) زمانی نەتەوایـەتی کورد دروست بو ، وەك زمانی کۆمەڵێك » . لێرەدا پێویست بە دوان ناکات لە باوەڕی بێ بەڵـگە و بێ بنچینەی گ. ب. ئاکۆپۆف . ئەوەی توسیوێتی هەر دوبارەکردنەوەی باوەڕەکانی ئو. ل. ڤیلچێڤسکییە[9] . تەنها لەوە دەدوێین ، کە توسەر لە دابەشـکردنی دەورەکاندا دەڵێ : « لە یەکەم جاردا ـ واتە لە زودا زمانی کوردی لە پەلی ئێرانی نەبو » ، وە لە دەوری دوەمدا ـ لە پێشکەوتنی کورد و زمانی کوردیدا بو بــە زمانێکی ئێرانی . ئـەم ئەنجامەی گ. پ ئاکۆپۆف گەیشـتویەتی پەیوەندییەکی راســتەوخۆی لەگەڵ ئەم باوەڕەدا هەیە : « ئـــەو کاردوخانەی کەزنەفۆن ناوی هێناون ، لە میللەتەکانی خاوەن زمانە ئێرانیەکان نین و هەروەها ئەوان باو و باپیری ئەم کوردەی ئێسـتا نین »[10]

---

(٩) بڕوانە : ق کوردۆ ، رەخنە لە بیر و باوەڕی هەڵە بەرامبەر بــە زمانی کوردی ، « کورتەی دەنگوباسی ئەوزگای رۆژهەڵاتناسی » ، بەرگ ١٢ ، مۆسکۆ ١٩٥٥ ، ل ٣١ ـ ٦١ .

(١٠) گ. ب. ئاکۆپۆف ، رەخنەی ـبێزۆبێ لە مەسەلەی نەژادی کورد ، =

بەپێی ئەو تیۆرییەی کە زمانی کوردی بە زمانێکی پێکهاتوو لە چەند زمانێـك دادەنێ و بە چەند دەورێکیدا دەبا ، هەروەها بە گوێرەی بیر و باوەڕی ئەو زانایانە کە بەبێ بەڵـگە کورد لە کاردوخ جیادەکەنەوە دێنە سـەر ئەو باوەڕە چەوتەی کە زمانی کوردی بە زمانێکی رەسەن نەزمێرن ، وە رەگەزی کورد دابنێن بەوەی کە لە چەند میللەتێك پێکهاتوە ، کە خاوەنی ئەتنۆگرافیای جیاواز و لەیەك دوورن .

ئو. ل. ڤیلچێڤـسکی لە دوا نوسراویدا «کورد ـ سـەرەتایەك لە مێژووی ئەتنۆگرافی گەلی کورد» ( بڵاوەخانەی ئەکادیمیەی زانستی سـۆڤێت ، مۆسکۆ ١٩٦١ ) وا نیشانی دەدا کە کورد لە نەژاددا هیچ پەیوەندییەکی مێژوویی و زمانی لەگەڵ کاردوخەکاندا نییە . بۆ روون کردنەوەی ئەم باوەڕەی لە باسەکەی کزنەفۆنەوە هەندێ بەڵـگەی هێناوەتەوە دەربارەی گفتوگۆ کردنی یۆنانەکان لەگەڵ کاردوخەکاندا ، بەڵام راستەوخۆ هیچ بەڵـگەیەکی بەدەستەوە نییە کە یۆنانەکان بە چی زمانێك لەگەڵ کاردوخەکاندا دواون ، هەروەها کزنەفۆن باسی ئەمە ناکات .

لە خوێندنەوەی کزنەفۆندا ( گـۆڕینی بۆ رووسـی : ئی. ئی. مەکسیمۆڤا ، مۆسکۆ ـ لێنینگراد ١٩٦١ ) ئێمە ورد دەبینـەوە لەو شوێنەی کە لە کتێبەکەدا باسی چۆنێتی گفتوگۆی یۆنـانەکان دەکات لەگەڵ لەشکری دوژمندا . لە لاپەڕەکانی ٥٥ ، ٥٧ ، ٥٩ دا کزنەفۆن

---

= «کورتەی نامەی دوکتۆری» ، پەرێشان ١٩٦٩ ، ل ٣٥ ـ ٣٦ .

کە باسی چۆنێتی گفتوگۆ و پەیوەندی دەکات ، یەك وشە چی بە نەبوتوە دەربارەی وەرگێر و دەربارەی ئەوەی کە بەچی زمانێك گفتوگۆیان کردوە . لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ شوێندا بەرچاو دەکەوێ : « کیر (سەرۆکی سوپای دوژمن - وەگێڕ ) لەگەڵ پیگریتی وەرگێردا ... » ( ل ٣٢ ) ، یا خود « سەرۆکە ستراتیجێکان بەرەو پیریان هاتن ، یەکەمیان لە رێگای وەرگێڕەوە وشەی ( تیسافیون )ی وت ... » ( ل ٥١ ) . لە لاپەڕە ٩٢ دا نوسراوە : « وەرگێڕی یۆنانەکان وتی ... » . ئەم بەڵگانە ئەوە نیشان دەدەن کە یۆنانەکان خاوەنی وەرگێڕی خۆیان بون . ئو . ل ڤیلچێڤسکی باوەڕی بەوە نییە کە یۆنانەکان لەگەڵ کاردوخەکاندا لە رێگای وەرگێڕی خۆیانەوە گفتوگۆیان کردبێ . ئەو نوسیویەتی : « پەیوەندی یۆنانەکان لەگەڵ کاردوخەکاندا بە گوێرەی وشەکانی کزنەفۆن - داوای یارمەتییان لە وەرگێڕە سەرەکییەکەی خۆیان نەکرد ، کە زمانی فارسی دەزانی » ( وتاری « کورد » ، ل ٦٥ ) .

دێینە سەر نوسراوەکانی کزنەفۆن دەربارەی پەیوەندی یۆنانەکان و کاردوخەکان . کزنەفۆن باسی چەند گفتوگۆیەك دەکا و بەم بۆنەیەوە نوسیوێتی : « سەرەکەکان سەرلەنوێ کۆبونەوە و دیلەکانیان کۆکردەوە ، وە دەربارەی چۆنێتی وڵاتەکانیان پرسیاریان لێکردن ، ئایا ئەوان جگە لەم رێگایە رێگایەکی تر نازانن » . لە لاپەڕە ١٠١دا دەڵێ : « لە رێگای گفتوگۆوە توانرا لاشەی کوژراوەکان وەربگیرێنەوە » . بەم نمونانەدا بۆمان ئاشکرا دەبێ کە لە وڵاتی کاردوخدا گفتوگۆ کراوە لەگەڵ هۆزە کاردوخەکاندا ،

بەڵام لە هیچ یەکێك لەو نوسینانەی کەزنەفۆندا دەربارەی گفتوگۆ لەگەڵ کاردۆخەکاندا کە خستومانەتە پێش چاو نابینرێ کە کەزنەفۆن وشەیەك چی بە نوسیبێتی کە گوایا یۆنانەکان « داوای یارمەتی یان لە وەرگێڕە سەرەکییەکەی خۆیان نەکرد » ، وەك ئو. ل. ڤیلچێڤسکی ئەمەی دروست کردوە . هەر دوا بە دوای ئەمە ئو. ل. ڤیلچێڤسکی لە لاپەڕە ٥ ـدا نوسیوێتی : لە کاتی گفتوگۆدا لەگەڵ کاردوخەکاندا ، یۆنانەکان : « سودیان لە دیلەکان بینیوە کە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بون ، وە تا سودیان لە دیلە کاردوخەکانیش وەرگرتوە » ، هەر بەم شێوەیەش گ. پ. ئاکۆپۆڤ دوبارەی دەکاتەوە . ئەو نوسیوێتی : « کەزنەفۆن دەڵێ کاتی کە چونە وڵاتییانەوە (وڵاتی کاردوخ — وەرگێڕ ) ، یۆنانەکان وەرگێڕی خۆیان گۆڕی ، ئەو وەرگێڕەی زۆ یارمەتی دابون لە گفتوگۆدا لەگەڵ میللەتە ئێرانیەکاندا »[11]. لە نوسراوەکەی کەزنەفۆندا شتی وەها نییە ، وە ئێمە لە کتێبەکەی کەزنەفۆندا زۆر گەڕاین ، بەڵام گەڕانەکەمان سودی نەبو و هیچ شتێکمان نەدۆزییەوە کە یۆنانەکان « وەرگێڕی خۆیان گۆڕیوە » ، یاخود سودیان لە « دانیشتوانی ناوچەکە وەرگرتوە » . بەم جۆرە دەرکەوت کە ئەمە هەڵبەستراوە . لە پاشا ئو. ل ڤیلچێڤسکی لە لێکدانەوەی بەڵگەکانی کەزنەفۆندا دێتە سەر ئەم ئەنجامە کە دەڵێ : « بەم جۆرە دەرکەوت کە کاردوخەکان بە زمانێکی ناوچەیی دەدوان ، نەك بە زمانێکی ئێرانی » . پاش چەند دێڕێك دەیەوێ باوەڕەکەی خۆی پتەو بکا و بۆ ئەمە کەزنەفۆن دەکات بە بەڵگە و نیشانە :

(١١) هەمان سەرچاوە ، ل ٣٠ ـ ٣٦ .

« به شایەتی ئەو (کەزنەفۆن — ق. کوردۆ) لەو دەمەدا کاردوخەکان بە زمانێکی ناوچەیتی دەدوان (واتە ئێرانی). بەداخەوە ئەمەش هەر ئو. ل. ڤیلچێڤسکی خۆی هەڵی بەستوە و شتی وەها لە کتێبەکەی کەزنەفۆندا نییە و لە راستییەوە دوورە. لە جیاتی ئەوە لە لاپەڕە ١٠٠ی کتێبەکەی کەزنەفۆندا چاومان بەو بەڵگەیە دەکەوێ کە شایەتە بۆ ئەوەی کە یۆنانەکان لە وڵاتی کاردوخەکاندا لە رێگای وەرگێڕەوە کاروباری پەیوەندییان بە رێوە دەبرد. « کەزنەفۆن لە رێگای وەرگێڕەوە لەگەڵیان کەوتە گفتوگۆ (کاردوخەکان — ق. کوردۆ) دەربارەی یەکێتی و وەرگرتنەوەی لاشەی کوژراوەکان ».

ئەنجامی هەموو بەڵگەکانی کەزنەفۆن دەربارەی پەیوەندی و گفتوگۆی یۆنانەکان لە باشوری وڵاتی کاردوخەوە، وە هەروەهاش لەناو وڵاتی کاردوخدا بەئاشکرا ئەوە رۆن دەکاتەوە و نیشانی دەدات کە لە رێگای وەرگێڕەوە گفتوگۆ کراوە و شێوەی گفتوگۆ کردنی یۆنانەکان لەگەڵ کاردوخەکاندا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ شێوەی ئەو گفتوگۆیەدا نەبووە کە لە باشوری وڵاتی کاردوخدا کراوە.

رەنگە پرسیار بکرێ: بەچی زمانێك یۆنانەکان لەگەڵ کاردوخەکاندا قسەیان کردوە، ئەگەر ئەوان « داوای یارمەتییان لە وەرگێڕە سەرەکییەکەی خۆیان نەکردبێ » ؟. بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە تەنها ئەوە دەتوانین بڵێین کە یۆنانەکان کەڵکیان لە وەرگێڕی یۆنانی ـ کاردوخی، یاخود کاردوخی ـ یۆنانی وەرگرتوە. دیارە لەناو کاردوخەکاندا پیاوی وا هەبوون کە زمانی یۆنانییان زانیبێ.

ئەگەر ئەمە وەربگیرێ ، پێویستە ئێمە لەسەر لێکۆڵینەوەکەمان بڕۆین و بڵێین ، کە کاردوخەکان لە کاتی خۆیدا میللەتێکی جیاواز و سەربەخۆ و بەهێز بوون . بەر لەوەی لەشکری یۆنانەکان بێتە وڵاتەکەیانەوە پەیوندی لە نیوانیاندا هەبووە . یونانەکان بۆ جێبەجێ کردنی کاروباری خۆیان لەگەڵ کاردوخەکاندا خاوەنی وەرگێڕی خۆیان بوون کە لەزمانی کاردوخیەوە شتی بۆ وەگێڕاونەتە سەر زمانی یۆنانی . هەر لەبەر ئەو هۆیەش دیارە کە کاردوخەکانیش خاوەنی وەرگێڕی خۆیان بوون . ئەمە تەنها تێبینی‌یە و بۆ چەسپاندنی هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی نییە هەروەها لە کەزنەفۆنیشەوە بۆمان ئاشکرابوو کە یۆنانەکان بۆ یەکەم جار بەرێکەوت چاویان بە کاردوخەکان کەوتوە و لەگەڵیان جەنگیون ، ئەویش لەو کاتەدا بوو کە یۆنانەکان بڕیاریان دا بە رێگایەکی تردا بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان بەم جۆرە دەتوانین بڵێین ، نە یۆنانەکان و نە کاردوخەکانیش هیچ پێویستی‌یان بەوە نەبوە کە وەرگێڕی تایبەتی خۆیان هەبێت ، بەڵکو بەپێچەوانەوە لە هەندێ شوێندا کەزنەفۆن نیشانی داوە کە لەم جەنگانەدا سوودیان لە وەگێڕی یۆنانی — فارسی وەرگرتوە و ئەم راستییەش مێژوو خۆی خستویەتیە پێش چاومان . وەك ئاشکرایە لە سەردەمی هاخامەنشی و ساسانیەکاندا دەوڵەتی یۆنان و ئێران بەهێزترین فەرمانڕەوای جیهان بوون و هەمیشە هاوپەیوەندی یەك بوون و هەندێ جاریش دژی یەکتر جەنگیون . ئاشکرایە بۆ ئەم مەبەستە چۆن یۆنانەکان ، هەروەها عەجەمەکانیش پێویستی‌یان بە وەرگێڕی یۆنانی — فارسی هەبوە . کەزنەفۆن باسی ئەمەی کردوە و

لەگەڵ ئـــەم وەرگێڕانەدا بە وڵاتی کاردوخدا تێپەڕیون . لەبەر ڕۆشنایی ئەم بەڵگانەدا ئاشکرایە ، کە گفتوگۆی یۆنانەکان لەگەڵ کاردوخەکاندا بە « زمانێـکی ناوچـــەیی نەبوە » ، بەڵـکو بە زمانی فارسی ، یاخود بە یەکێك لە زمانەکانی تری ئێرانی بوە . بەمـەدا ڕوَن دەبێتەوە کە کاردوخەکان چۆن بە گەلێك بەڵـگەی ئەتنۆگرافی کە لە سەرەوە باسمان کردن ، هەروەها بە زمان یەکێـکن لە میللەتانی ئێرانی زمانەکانی کوردستانی کۆن و هـــەروەها باو و باپیری ئەم کوردەی ئێستان . بەداخەوە ئەو زانایانەی کورد بە نەوەی کاردوخ دادەنێن گرنـگییەکی زۆریان نەداوە بەوەی نیشـانی بدەن کە زمانی کاردوخەکان لە کام خێزانە زمانە .

چەند وشەیەك دەربارەی مانای وشەی « کاردوخ »

هەندێ لە زانایان لەو باوەڕەدانـــ ، کە ئەم وشـــەیە ناوی میللەتێـکە و وشەکە لە زمانی ئەرمەنیدا دروست بوە . هەندێـکی تر لە زانایان لەو باوەڕەدانـــ ، کە ئەم وشـــەیە لە زمانی دانیشتوانی هەرێمێـکی تایبەتیدا دروست بوە و ناوی میللەتی ئەم هەرێمەیە کە خۆیان ئەو ناوەیان لە خۆیان ناوە . ئەمە هەر چۆنێك بوبێت گرنگ نییە ، ئەوەی گرنـگ بێت بۆ ئێمە ئەوەیە کە لەســـەر بنچینەی بەڵـگەکانی کەزنەفۆنـــ ئاشکرابوە کە وشەی « کاردوخ » مانایەکی ئەتنۆگرافی هـەیە . بەم بۆنەیەوە ئو. ل ڤیاچێفسـکی ڕاستە کە نوسیویێتی : وشەی « کاردوخ » تەنها ناوی ئەو هۆزە ( کاردوخ ـ ق . کوردۆ ) نەبوَ لای میللەتانی دراوسێ ، بەڵـکو ئەو ناوەش بوَ کە

خۆیان لە خۆیان نابوو (١٠١) . ئادۆنس لە نووسراوەکەی «ئەرمەنستان لە دەوری یوستین»دا نووسیویێتی : لە وشـەی «کاردوخ»دا پیتی کۆتایی (خ) لە پیتی (ك)ەوە هاتووە کە نیشـانەی کۆیە (جمع) لە زمانی ئەرمەنیدا . لەسـەر بنچینەی ئەم بیر و باوەڕە مێژوونووسی فارس رەشـید یاسمی ، هەروەها گ پ. ئاکۆپۆڤ و چەنـد زانایەکی تر دەڵێن : یۆنانەکان ئەم وشەیە (کاردوخ — وەرگێڕ)یان لە دەمی ئەرمەنی بیستووە ، کە گوایا یەکێـکی ئەرمەنی وەرگێڕ بووە لە کاتی گفتوگۆی یۆنانەکان لەگەڵ کاردوخەکاندا . لەبەر ئەمە ئەو زانایانەی لەسەرەوە ناومان بردن هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕەی ، گوایا کاردوخەکان بە زمانێك دواون کە لە زمانی ئەرمەنییەوە نزیك بووە ، لەبەر ئەوەش زمانی کاردوخەکان بە زمانێـکی ئێرانی نازمێرن . لێـکدانەوەی ئەو زانایانە زۆر چـەوت و بێ بەڵـگەیە .. جا بۆ دەرخستنی ئەو ناڕاستییە دەڵێین : بەر لە هـەموو شتێك دەبێ ئەوە لەبیر نەکەین کە باش ئەوەی یۆنانەکان چوونە وڵاتی کاردوخەوە ئینجا دوای ماوەیەك بۆ یەکەم جار چوونە ئەرمەنستان . کاتێ یۆنانەکان قسەیان لەگەڵ کۆمارخ (سەرۆکی گوندی ئەرمەنستاندا)دا دەکرد ، لێیان پرسی : «ئەمە چ وڵاتێـکە ؟ ئـەو وەڵامی دایەوەیە : ئەرمەنستانە» (ل ٣٠ — ٤٠) . بەم جۆرە روون بۆوە کە یۆنانەکان وەرگێڕیان نەبووە بۆ زمانی ئەرمەنی و کە ئەو وەرگێڕەش خـۆی ئەرمەنی بووبێت ، هەروەها پێویستیان بەمە نەبووە . وەك بە بەڵـگەکانی کەزنەفۆنـدا دەردەکەوێ ، تەنها لە رێـگای وەرگێڕی فارسی — یۆنانییەوە گفتوگۆیان کردوە ، نەك هـەر لەگەڵ فارسەکان و

کاردوخەکاندا ، بەڵکو لەگەڵ ئەرمەنەکانیشدا . لێرەدا دەرکەوت ئەو باوەڕە کە وای دادەنێ ، گوایا یۆنانەکان لەگەڵ وەرگێڕە ئەرمەنییەکاندا تێپەڕبوون بە وڵاتی کاردۆخەکاندا باوەڕێکی راست نییە . دەتوانین بێینە سەر ئەو باوەڕەی کە بڵێین وشەی « کاردوخ » بەر گوێی یۆنانەکان کەوتوە لە گفتوگۆی ئەرمەنەندا نەك لە وڵاتی کاردوخەکاندا بەڵکو لەناو ئەرمەنستاندا . ئەمە لە راستییەوە نزیکە و بەڵگەش هەیە بۆ ئەوەی ئەم باوەڕەمان بچەسپێنین .

وەك ئاشکرایە ، لەبەر رۆشنایی بەڵگەکانی گزەنەفۆن ئێمە دەزانین ، کە کاردوخەکان زیانیان زۆر لە یۆنانەکان دا ، لەگەڵیاندا جەنگان ، بە هەمو شێوەیەك رێگایان دەگرت و تەگەرەیان دەخستە بەردەم یۆنانەکان کە بەوڵاتەکەیاندا تێنەپەڕن بۆ یۆنانەکان ئاسان نەبوو لەماوەی حەوت رۆژدا کە بۆوچان لە شەڕدا بون لەگەڵ کاردوخەکاندا ، توانیبێتیان هێندە دەنگوباسی گرنگی کاردوخەکان بزانن ، وەك « کاردوخەکان سەربەخۆ دەژیان ، لەگێژاو و هەرادا بون دژی حکومەتەکەیان » و « هەتا بندەستی پادشاکەشیان نەدەکرد » ( پادشای فارس ) ( ل ١٤٨ ـ ١٥٩ ) . ئەوەی لەراستییەوە نزیکتر بێت ئەوەیە ، کە یۆنانەکان ئەم دەنگوباسەیان لە ئەرمەنستان وەرگرتووە ، بەم وڵاتەدا بەئاسانی تێپەڕبوون ، بێ هیچ تەگەرەیەکی وەها کە شایانی باس بێت . یۆنانەکان لەم زروفە باشەدا کە لە ئەرمەنستان هەیانبوو توانیویانە بەئاسانی و بە دوور و درێژی دەنگوباسی کاردوخەکان لە کۆمارخ (سەرۆکی گوندی ئەرمەنستان) وەربگرن . دەبێ ئەوەش لە بیر نەکەین کە گزنەفۆن وشەی « کاردۆك » بە

فۆنێتیکی ئەرمەنی لە نوسراوەکەیدا کردویە بە «کاردۆخ».

رەشید یاسمی لە رێگای بەڵگەکانی سترابۆنەوە دەڵێ : وشەی «کاردۆخ» و «کاردۆك» مانای هۆزێکی کۆچەری ئازا بووە . ئەو وشەکانی سترابۆن دەهێنێتەوە کە دەڵێ : «فارسەکان لاوەکانیان بە جۆرێك پەروەردە دەکەن، کە بتوانن بەرگەی سەرما و گەرما و باران بگرن ، فێریان دەکەن شەو لە کێوان لەگەڵ ئاژەڵەکانیادا بێننەوە ، لاوەکانیان بە بەرهەمی درەختی ناو دراستان دەژین ، وەك بەڕو . کاردوخەکان لەسەر دزی و جەردەیی دەژین ، وشەی «کاردۆخ» مانای مرۆڤی ئازا و شەڕکەر »ە . دوا بە دوای ئەمە رەشید یاسمی دەڵێ : وشەی «کاروك» ، «کاردۆك» ، «کورد» مانای مرۆڤی ئازای پەروەردە کراوی کۆچەرانە ، وە لەم بارەیەشەوە وشەی «کورد»یان بەکار هێناوە وەك «ئازا ، نەبەرد ، قارەمان ، بەهێز» (١٢) لەم وشانەدا دەتوانین بێینە سەر ئەو ئەنجامەی کە وشەی «کارداك» ، «کاردۆخ» مانایەکی کۆمەڵایەتی و ئەتنۆگرافییان هەبووە ، وە ئەم وشانە لەسەر بنچینەی زمانە ئێرانیەکان دروستبون . لێرەدا پێویست بەوە ناکات رونی بکەینەوە کە کۆتایی ئەم وشانە (ئاك و ۆك) پەیدابون لە پاشگری (ەکە ـ eke) کە لە زمانە ئێرانیەکاندا زۆر بەکار دەهێنرێن ، وەك پاشگرێك بۆ مانایەکی ناسراو ، کە دەلکێندرێت نەك تەنها بە ناوەوە ، بەڵکو بە ئاوەڵناویشەوە . بۆ نمونە دەبینین ، وشەی «مەردەکە» کە

---

(١٢) سەرچەوەی ناوبراو ، رەشید یاسمی ، ل ١٠٧ .

وشەیەکی فارسی کۆنە و شێوەکەی کە « مەریکە » ، هەردوکیان مانای « مرۆڤ ، پیاو » دەدەن . لە زمانی کوردیدا ئەم پاشگرە ، ئەو شێوانە : ( ەك ، ۆك ، وك ، یك ) [13] وەردەگرێ . بــــۆ نمونە ( ســەرەك و سەرۆك ) لە وشــەی ( ســەر ) ەوە ؛ ( چیرۆك ) ، ( ناوك ) ، ( بەریك ) ... هتد .

وشەی « کاردۆخ » بەو شێوەیەی گزنەفۆن نوسیویەتی دیارە پەیوەندییەکی راستەوخۆی لەگەڵ شێوەی « کاردۆك »دا هەیە ، کە وا هەر بەم شێوەیەش تۆمارکراوە لە نوسراوەکانی مێژوناسانی ئەرمەن لە سەدەکانی ناوەڕاستدا . بەڵام ئەگەر ئەو باوەڕە بەراست دابنێین کە دەڵێ : « کاردۆخ »ی گەزنەفۆن لە رەگ ( کاردۆ ) پێکهاتوە ، وەك ناوی میللەتێك ، لەگەڵ ( ك ) کە نیشانەی کۆیە ( جمع ) لــــە زمانی ئەرمەنیدا . ئەوسا ناتوانرێ بگوترێ کە وا « کاردۆك ، کاردۆخ » بە ئەتنۆگرافیا و زمان بەشێك نین لە خێزانی زمانە ئێرانیێکانی دانیشتوانی کۆنی کوردستان . ئەگەر وشەی « کاردۆخ » لە زمانی ئەرمەنیشەوە کەوتبێتەوە ، ئەوە دوا ئەنجام تەنها ئەوەیە کە دەبێ « کاردۆك » — بە زمانی ئەرمەنی ، وە « کاردۆخ » — بە زمانی فارسی یەك گوتبن وەك ناوێ کە بە میللەتێکیان گوتبێ و وەك ناوی میللەتێ کە خۆی بەخۆی گوتبێ .

بــــەم جۆرە لە رێگای بەڵگەکانی گزنەفۆنەوە دەربارەی

---

(١٣) ق. کوردۆ ، مانا و فرمانی پاشگری ـ ك ـ ( ەكە ) لە زمانی کوردیدا ، « لێکۆڵینەوە لە مێژوی کولتوری میللەتانی رۆژهەلات » ، بــۆ بیرەوەری ئەکادیمی ئی. ئا. ئۆربیلی ، ١٩٦٠ .

گفتوگۆی یۆنانەکان لەگەڵ کاردوخەکاندا ، هەروەها لە ڕێگای لێکدانەوەی مانا و دروست بوونی وشەی « کاردۆك و کاردۆخ »دا دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامە کە بڵێین - کاردوخەکان لە خێزانی زمانە ئێرانێکانن .

بەڵگەی گرنگی باوەڕپێکراو و چەسپێنەری مێژوویی و زمانیی دەربارەی پەیوەندیی کاردوخەکانی کۆن و کوردەکانی ئێستا ، ئەو پیشکەوتن و ئەنجامەیە کە کوردناسەکانمان و زمانناسەکانمان گەیشتوینەتێ . لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیی و دیالێکتەکانیدا گەلێك بەڵگەی ڕێزمانی « گراماتیکی » و وشەکانی زمانیان دۆزیوەتەوە ، کە لەو ڕێگایەوە توانیویانە ئەو راستییە بچەسپێنن و بەتەواوی نیشانی بدەن . ئەو بەڵگانە پەیوەندیی راستەوخۆی زمانی کوردیی ئێستا لەگەڵ زمانە ئێرانێکانی کۆن نیشان دەدەن .

* * * *

# چەند تێبینییەک لەسەر
# کتێبەکەی ڤیلچێڤسکی

لە ساڵی ١٩٦١دا ئو. ل. ڤیلچێڤسکی لێکۆڵینەوەیەکی لە ژێر ناوی «کورد . سەرەتایەک لە مێژوی ئەتنۆگرافیای گەلی کورد»دا بڵاوکردەوە . ئەم کتێبە ١٦٢ لاپەڕەیە و پێکهاتووە لە : پێشەکی (ل ٣ ـ ٤) و هەشت فەسڵ (ل ٥ ـ ١١٦) و هەندێک سەرنج (ل ١١٠ ـ ١٦٢). لە فەسڵی یەکەمدا (ل ٥ ـ ٢٥) باسی رێباز و چۆنێتی رێگای لێکۆڵینەوە دەکات لە ئەتنۆگرافیای میللەتان . لێرەدا رای خۆی دەدات، کە لێکۆڵینەوە لە نەژاد و دروست بوونی میللەت پێویستە لە سەر چی بنچینەیەک بێت . نوسەر دژی ئەو رێگا راستە وەستاوە ، کە لە مێژە لە سەر شێوەیەکی زانستی سەربارەت بە لێکۆڵینەوە لە ئەتنۆگرافیای میللەتاندا چەسپاوە . ئەو نوسیویتی : «کەرەستەی ئەنترۆپۆلۆژی (علم الانسان) و ئەتنۆگرافی و جوگرافی ... ، کەرەستەیەک نییە کە بۆ رۆن کردنەوەی مێژوی دروست بوونی میللەتان بتوانرێ پشتی پێ ببەسترێ» (ل ١٢). بۆ مێژوناس و ئەتنۆگراف و زمانناس ئەم باوەڕەی نوسەر شتێکی سەیرە . گەر ئەم کەرەستانە بۆ رۆن کردنەوەی

نەژاد و دروست بوونی میللەتێك بۆ سوودن و پشتیان بۆ نابەسترێ ، ئەوە ئەمانەوی لە نووسەر بپرسین : گەر وایە ، ئەی بۆچی ئاموزگای ئەنترۆپۆلۆژی و ئەتنۆگرافی لە ئادیمیەی زانستی سۆڤێت هەیە و بوونی چی سوودیکی هەیە ؟ پێویست بە روون کردنەوە ناکات . خۆ ئاشکرایە ، گرنگی ئەم ئاموزگایە ئەوەیە کە زاناکانی بە لێکۆڵینەوەی ئەتنۆگرافیای میللەتانەوە خەریکن . لێکۆڵینەوەیان لەسەر بنچینەی کەرەستەیەکە کە لە زانستی ئەنترۆپۆلۆژی و ئەتنوگرافی و زمانەوانیدا دەستی دەخەن . مەبەستی نووسەر دەربارەی لێکۆڵینەوەی لە میللەتی کورد ، وەك خوی نووسیویەتی ئەوەیە : « بەپێویستی دەزانم کە سەرلەنوێ بڵێم ، مەبەستم ئەوە نییە و گرنگیش نییە هەوڵ بدەین بۆ روون‌کردنەوەی نەژادی (کورد - وەرگێڕ) لە کام میللەتی کۆنەوە هاتووە ، یاخود حوری و ولولوبی و کاشی و حیثی و ماد ... هتد سەرچاویان چی میللەتێك بووە ، کە تەنها ناویان بۆ ئێمە ئاشکرایە ... بەڵکو مەبەستمان روون‌کردنەوەی هەندێك باری کولتور و کۆمەڵایەتی و نەریتی زمانە ، کە وا خزمایەتی کورد لە گەڵ میللەتانی دراوسێی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نیشان دەدات . لەم رێگایەوە دەتوانین وێکچوونی جۆرجی و ئەرمەنی ، لێك‌چوونی فارس و ئازربایجانی .... هتد روون بکەینەوە » .

لەم چەند دێڕەی نووسەردا ئاشکرا دیارە :

هەرچەندە نووسەر لە بەشی یەکەمی ئەم چەند دێڕەدا دەڵێ : مەبەستی ئەو گەڕان نییە بە دوای نەژادی کورددا ، بەڵام لەگەڵ

ئەوەشدا ئەو لە مەبەستەکەی خۆی لادەدات . دەبینین لە کتێبەکەیدا بە شێوەیەکی دوور و درێژ بیر و باوەڕی هەموو زانایان لەگەڵ بەڵگەکانیانی هێناوەتەوە دەربارەی ئەتنۆگرافیا و زمانی لولوبی و کاسی و گوتی و حیثی و حوری و ئورتو و ماد و کورت و کاردوخ و .... هتد ، هەروەها هەوڵی داوە پەیوەندییان لەگەڵ کورددا نیشان بدات . واتە هەر ئەو رێگایەی گرتووە کە هەندێ زانای کوردی دەرەوە گرتویانە ، وەك : ئەمین زەکی ، عەلائەدین سەجادی ، رەشید یاسمی و هەندێکی تر . بە شێوەیەکی گشتی ، هەموو ئەم زانایانە مێژووی میللەتەکەیان نووسیوە بە دەست پێکردنێك لە مێژووی میللەتانی کۆن ( گوتی ، کورت ، کاسی ، کاردوخ ، ماد ... هتد ) ، کە لە ناوچە شاخاوییەکانی ئەمڕۆی کوردستاندا دەژیان . راستە بیر و باوەڕیان جیاوازە سەبارەت بەوەی ئەم میللەتانە باو و باپیری کوردن یان نا . هەندێکیان لەسەر ئەو باوەڕەن کە ئەم میللەتانە باو و باپیری کوردن . هەندێکی کەیان باوەڕیان بە شێوەیەکی کەیە . جیاوازی بیر و باوەڕیشیان بە شێوەیەکی گشتی کار تێکردنی ئەو جیاوازییەیە کە هەیە لە نێوان زاناکانی رۆژئاوادا . بەڵام ئەوەی راستی بێ و ئەوەی بێ جیاوازی بێ ئەوەیە کە هیچ یەکێك لەو زانا کوردانەی ناومان بردن ، دەستیان نەکردوە بە نووسینەکانیان دەربارەی مێژووی کورد و رەگەز و کولتوری بۆ نیشاندان و روون کردنەوەی ئەو رووداو و بەڵگە مێژووییانەی ئاشکران و لەم زانستەدا جێگیر بوون دەربارەی ئەو میللەتانەی کۆن . بەم جۆرە ئاشکرایە ، ناتوانرێ و لە تواناد نییە دەست بکرێ بە نووسینی مێژووی

ئەتنوگرافیای کورد بۆ ئەمە ( ڕووداو و بەڵگە مێژووییانە ـ وەرگێڕ ) .
لێرەدا ئۆ. ل. ڤیلچێڤسکی ڕاست نییە ، کە دەڵێ « بەلای ئێمەوە مەبەســـت نییە و گرنگ نییە ، ئەم میللەتانەی کۆن سەرچاوەی دروست کردنی چی میللەتێکی ئەمڕۆن .

ئەوەی بەلای ئێمەوە بە هیچ جۆرێك ڕاست نەبێ و ئەوەی لەگەڵ باوەڕی ئێمەدا نەگونجێ بەشی دووەمی مەبەستەکەی نووسەرە ، کە دەڵێت : بەلای منەوە مەبەست « ڕوون کردنەوەی هەندێك باری کولتور و کۆمەڵایەتی و نەریتی زمانە ، کە وا خزمایەتی کورد لەگەڵ میللەتانی دراوسێی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نیشان دەدات » .
بەر لە هەمو شتێك لە نووســەر دەپرسین : تێ ناگەین نووســەر دەربارەی چ باری کولتور و کۆمەڵایەتی و نەریتی زمانەوە دەدوێت ؟ .
خۆ لە کتێبەکەیدا هیچ فەســڵێك، یاخود هیچ بەشێك نییە دەربارەی ئەم باســە . تەنها هەندێ جار نەبێ لە باســەکانیدا کە بە شێوەیەکی ساکار و بە پەلە بە دەوری کوێلایەتیدا تێدەپەڕێ .
پێویستە ئەوەش لە بیر نەکەین کە مەبەستی نووسەر ئەوە نییە نیشانی جیاوازیی کورد بدات لەگەڵ میللەتانی دراوسێدا ، بەڵکو دەیەوێت تەنها وێکچوونیان نیشان بدات . بەم جۆرە دەبینین بۆ لێکۆڵینەوەی مەسەلەی ئەتنۆگرافیای میللەتی کورد تەنهــا چمکێکی زانستەکەی گرتووە . لە جیــاتی گەڕان بە دوای بەڵگە و ڕووداوی واقعی مێژوویی و ئەنترۆپۆلۆژی و ئەتنۆگرافی و زمانەوانی و .... دا ، کە لەم ڕێگایەوە دەتوانرێ ڕەوشت و نەریت و زمان و کولتوری

میللەتی کورد نیشان بدرێ ؛ لە جیاتی چۆنێتی شێوەی کۆمەڵایەتی و چۆنێتی دروست بونی لای میللەتی کورد ؛ لە جیاتی یەکالآ کردنەوەی چۆنێتی زبان و رەوشتی ناوخۆی کوردەواری ؛ لە جیاتی لێکۆڵینەوە لە پێشکەوتن و دروست بونی میللەتی کورد ، ئو. ل. ڤیلچێڤسکی خۆی بە رون کردنەوەی مەسەلەی شێوەی کۆمەڵایەتی و مێژوی میللەتانی کۆنی رۆژئاوای ئێران و ئاسیای بچوك و پشت قەفقاسەوە خەریك کردوە . لەم رێگایەوە ویستویەتی ئەو شتەی کورد کە لە دراوسێکانی دەچێ نیشانی بدات . بێگومان گرتنی رێگایەکی وا چەوت و یەك لا لە لێکۆڵینەوەی مەسەلەی ئەتنۆگرافیای هەچ میللەتێك بێت ، توسەر توشی گەلێك هەڵە دەکات و ئەو لێکۆڵینەوەیە نرخێکی زانستی نابێت و بێسود دەمێنێتەوە .

فەسڵی دوەم (ل ٢٥ — ٣٥) دەربارەی دەوری پێکهاتنی زمان و ئەتنۆگرافیا و کولتوری میللەتانە . ئەم فەسڵە بزە لە تونە کە هێنراونەتەوە لە نوسراوەکانی ن. ب. پیاتروفسکییەوە (ل ٢٥ ـ ٢٩) دەربارەی هۆزە کۆچەرەکان و چۆنێتی دروست بونیان ، دەربارەی پێشکەوتنی بەخێوکردنی ئاژەڵ و بەکارە هێنانی زەوی لە ناوەڕاستی هەزارەی دوەمی پێش زایندا ، لە ناوچە شاخاوییەکانی ئاسیای بچوك و رۆژئاوای ئێران . لە پاشا لە (ل ٢٥ — ٢٩) دا باوەڕی گەلێك زانا نیشان دەدا سەبارەت بە زیانی کۆمەڵایەتی میللەتەکانی کۆن (گوتی ، کاسی .... هتد) و دەربارەی ئەوەی لە چ خێزانێکی زمانن . لە (ل ٣٢ — ٣٥) دا دەڵێ : لە کۆتایی هەزارەی دوەم و سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایندا لە ناوچە شاخاوییەکانی هەرە کۆنی

ژیاندا دەوری تەشەنەکردن و بڵاوبوونەوەی هۆزە هیند و ئەوروپاییەکان دەست پێ دەکات . هەر لەو دەمەشدا دەوری تەشەنەکردن و بڵاوبوونەوەی هۆزەکانی سامی و ئارامی ، بە تایبەتی بەشی سەرووی میزۆپۆتامیا دەست پێ دەکات ، کە لێرەدا ( سەرووی میزۆپۆتامیا — وەرگێڕ ) لەگەڵ دانیشتوانی زووی ئەم هەرێمەدا تێکەڵ بوون . بەم بۆنەیەوە ئەو دەدوی لەوەی ، کە گوایا کورد لە ئەسڵدا لە عەرەبەوە هاتوون . بۆ بەڵگەش هەندێ بەسەرهات و ڕوداوی کوردی هێناوەتەوە دەربارەی پەیوەندی و نزیکی زمانی کوردی و عەرەبی ، دەربارەی نزیکی لە چۆنیەتی دروست بوونی کۆمەڵایەتی هۆزەکانی کورد و عەرەب و .... هتد . بە باوەڕی ئەو ، ئەوە دەری دەخا ، کە ڕەگێکی قووڵ و درێژ هەیە لە نیوان پەیوەندی ئەتنۆگرافی عەرەب و کوردا ( ل ٢٤ ) .

بەکورتی لەسەر هەندێك لە بەڵگەکانی نووسەر دەدوێین .

بەر لە هەموو شتێك چەند وشەیەك دەرباری ئەوەی کە دەڵێ ئەسڵی بەسەرهات و ڕوداوی کوردی لە عەرەبیەوەیە . ڕاستە ئەم جۆرە بەسەرهات و ڕوداوانە لە ئەدەبی کوردی سەدەکانی ناوەڕاستدا هەیە ، وەك : لە پێشەکی نووسراوەکەی شەرەف خانی بتلیسیدا « مێژووی کورد » و لە نووسراوەکەی مەلای بایەزیدیدا « خوو و ڕەوشتی کورد » و لە هەندێك بەرهەمی فۆلکلۆری کوردیدا ، کە هەندێ جار قارەمانانی داستانێکی کوردی عەرەبن ، یاخود سەرۆکی هۆزێکی کورد بە قارەمانێتی ناوی دەرکردوە لە ئەسڵدا لە هۆزێکی عەرەب بووە . بەم بۆنەیەوە ئو. ل. ڤیلچێڤسکی دەڵێ ، هەموو کوردان

ئەسڵی خۆیان بە عەرەب دادەنێن. ئەو نووســـیوێتی : « نەك تەنها کوردان ئەسڵی خۆیان بە عەرەب دادەنێن ، بەڵـکو پاڵـەوانانی داستانە کوردیـیەکان بەشی زۆریان ئەسڵیان عەرەب بوە . خزمایەتی هەیە لە نیوان هۆزەکانی عەرەبدا ، کە قارەمانیەتیان ئاشـکرایە نەك تەنها لە ناوچە شاخاوییە کوردیـیەکاندا ، بەڵـکو لە ناوچە دەشتاوییە عەرەبیـیەکانیشدا » ( ل ٣٤ ) ئاشکرایە ، گەر هەندێك لە پاڵەوانانی داستانە کوردیـیەکان ، یاخود هەندێ پێشەوا و سەرۆکی هۆزەکان لە داستانەکاندا ، یاخود هەندێك نووسەری کورد بـــە عەرەب بدرێتە قەڵەم ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە کورد لە عەرەبەوە پەیدابوبی . هۆی هەرە گەورەی ئەمە ئەوەیە : لەو سەدانەی عەرەب دەورێـکی گرنگی دەبینی لە کۆمەڵایەتی و ئایین و سیاسەتدا ( لە نیوان هەندێ لەو میللەتانەی ئاینی ئیسلامیان وەرگرتبو ) ، زۆر باو بو کە بە شانازییەوە خەڵك ئەسڵی خۆی بە عەرەب دابنێ . جا رەوشـنایی ئەم وەزعەش لە بەسەرهات و داستانەکاندا تیشکی داوەتەوە . لەسەرێـکی کەوە خۆ بە عەرەب دانان بەو مەبەستە بوە کە ئەسڵی خویان و قەومیان بشارنەوە . ویـستویانە خۆیان لەگەڵ کۆمەڵی سەرکەوتو دابنێن . ئەمەش ڕێگایەك بوە بۆ خۆ دوور خســـتنەوە و خۆ پاراسـتن لە گەلێك ناخۆشی و کوێرەوری و بێبەختی .

دووەم بەڵـگەی نووســـەر بۆ پەیوەندی ئەتنۆگرافیای کورد و عەرەب ئەوەیە کە نووسیوێتی : « ئەو پەیوەندییەی هەیە لە نیـوان زمانی کوردی و زمانە سامیـیەکاندا ، گەلێك نزیکتر و بە هێزترە وەك لەو پەیوەندییەی هەیە لە نیوان زمانە ئێرانیـیەکاندا » ( ل ٣٤ ).

لێرەدا ئەمەوی لە نوسەر بپرسم : دەربارەی چ پەیوەندییەکی زمانی دەدوێ لە نیوان زمانی کوردی و زمانە سامێـکاندا ؟ . خۆ نوسەر ئەمەی نیشان نەداوە ، وە هیچ کوردناسێك ئەمەی بۆ دەرنەکەوتووە ، کە ئەو پەیوەندییە نزیك و بە هێزە چییە ....

لێرەشدا هەر لەسەر شێوە و چۆنێتی دروست بوون و پێکهاتنی هۆزەکانی کورد هەندێ لێك‌چوونی دۆزیوەتـەوە کە لـە میللەتانی دراوسێ دەکەن و بـەم جۆرە دەیانکات بە خزم . لـەم بارەیەوە نوسیویەتی : « ئەو شـێوەیەی لە چۆنێتی دروست بوون و پێکهاتنی هۆزە کوردەکاندا هەیە ، هەر ئەو شێوانەن کە لە میللەتانی کۆن و میللەتە ئێرانیـکان و سامێکان و تورکەکاندا هەن » ( ل ١١٦ ) .

دەتوانین بڵێین ، کە نوسەر دەربارەی جیاوازی کورد لە گەڵ میللەتانی دراوسێیدا ، دەربارەی رەوشت و ژیان و خاسیەتی زمان و کولتوری مێژوی میللەتی کورد هیچی نەنوسیوە . بە باوەڕی ئەو کورد هیچ شتێکی تایبەتی خۆی نییـــە . ئەوەی کە هەیەتی وەك ئەوانەی دراوسێـکانێتی . تەنها لەیەك شوێندا باسی شێوەیەکی رەوشتی کوردەواری دەکات ، ئەویش لەو شوێنەدایە کە باسی مانەوەی دەوری ئافرەت لە خێزاندا دەکات لە ناو کورددا . بەم بۆنەیەوە نوسیویەتی : ئەوەی کورد لە زوربەی میللەتانی ئاسیای بچوك و ئێرانی دراوسێی جیـا دەکاتەوە ، ئەوەیە کە ئافرەتی کورد ئازادە و دەوری بەرزە لە کۆمەڵدا ( ل ٤٠ ) . لە کتێبەکەی ئو. ل. ڤیلچێفسـکیدا جگە لەمە هیچی ترمان بەرچاو ناکەوێ . خۆ کاتێك نوسەر باسی هەندێ لە

ڕەوشت و کولتوری کورد دەکات مەبەستی ئەوە نییە کە نیشانی بدات چی کورد لە دراوسێکانی جیا دەکاتەوە ، بەڵکو هەر بەو مەبەستەی بەزۆر کورد بکات بە خزمی میللەتەکانی دراوسێی . لەبەر ئەمە نوسەر هەوڵ دەدات پەیوەندیی زمان و ئەتنوگرافیی و کولتوریی کورد لەگەڵ میللەتانی زوو و ئێستادا نیشان بدات . بە زۆری گرنگی داوە بە پەیوەندیی لە نێوان کورد و عەرەبدا (ل ٢٤ ـ ٢٥ ) ، لە نێوان کورد و ئارامیی ، کورد و سامیی (ل ٢٢ ـ ٢٥ ) ، کورد و یافیتیی (ل ٦٩ ـ ٧٢ ) ، کورد و ماد (ل ٧٢ ) ، کورد و کاردوخ ( ٦٩ ـ ٧٢ ) ، کورد و تورك (ل ٧٢ ) .... هتد .

بەڵگەی سێیەمی بۆ پەیوەندیی کورد و میللەتە سامییەکان ئەوەیە ، کە دەڵێ نزیکی لە چۆنێتی دروست بونی کۆمەڵایەتیی لە نێوان هۆزەکانی کورد و عەرەبدا هەیە . ئەو ئەمە وا ڕوون دەکاتەوە : « زاراوەکانی دروست بونی کۆمەڵایەتیی هۆزەکانی کورد نەك تەنها لە شێوەکانی زمانە ئێرانییەکان نزیکن ، بەڵکو هەروەها نزیکیشن لە زمانە سامییەکان (ل ٣٤ ) . بەڵگەی چوارەمی ئەوەیە ، کە دەڵێ هێستر و ئەسپی کوردیی ئەسڵیان عەرەبییە . بەم بۆنەیەوە نوسیویەتی : « هێستری کوردیی زوو لە ناوچە گەرمە چۆڵەکانی نیمچە دورگەکانی عەرەبیی بووە و دوایی هێنراوە بۆ ناوچە شاخاوییەکانی ئاسیای بچوك » (ل ٣٥ ) . هەر ئەوەش دەڵێ سەبارەت هێنانی ئەسپی عەرەبیی بۆ ناوچە شاخاوییەکانی ئاسیای بچوك (ل ٤١ ـ ٤٢ ، ١٠١ ) .

نوسەر چەند نمونەیەکی هێناوەتەوە کە بە باوەڕی ئەو ، ئەو

نموونانە نیشانی پەیوەندیی ئەتنوگرافیی کورد دەدەن نەك تەنها لەگەڵ هۆزە سامییەکان ، بەڵکو هەروەها لەگەڵ دانیشتوانی زۆی ئاسیای بچووك و میسۆپۆتامیا و پشت قەفقاسیشدا . یەکێك لە نموونەکانی ئەوەیە کە دەڵێ : فۆنێتیکی زمانی کوردیی « بە تەواوی وەك فۆنێتیکی زمانە ئێرانییەکانی کە وەهایە ، بەڵام شکی تیدا نییە کە هەروەها وەك فۆنێتیکی زمانی ئەرمەنی و زمانی عەرەبیشە » ... « لەبەر ئەوەی ئەم وێکچوونە هەموو لقەکانی زمان دەگرێتەوە بە تێکڕایی ، بۆیە ناتوانرێ وەك کارێکی بنچینەیی ڕوون بکرێتەوە » ( ل ١٦ ) .

نووسەر هەتا لە ناو کوردی یەزیدی و کوردی موسڵماندا نموونە دەدۆزێتەوە ، کە بە باوەڕی ئەو ئەو نموونانە نیشانی پەیوەندیی ئەتنوگرافیی دەدەن لە نیوان کورد و میللەتانی دراوسێدا . ئەو نووسیویتی : « لە سنووری کۆمەڵی کوردانی موسوڵماندا هێندە ڕەوشتی ئاینی پێش ئیسلامی ، وەك ( مانەویی و زەردەشتیی ) نییە ، وەك هێندە باوەڕی کۆنی ئاینی زۆی ڕۆژهەڵاتی هەیە ، کە پەرستنی ڕۆژ و مانگ و هێزی سروشتە ... هتد » ( ١٤ ) . لەم بارەیەوە درێژە بە باسەکەی دەدا و دەڵێ : لە کتێبە ئاینییەکانی یەزیدیدا ئەوە هەیە کە ( نەبوخەزنەسر و بیلزیبوب ) دەکەن بە پادشای خۆیان . بەم بۆنەیەوە نووسەر دێتە سەر ئەو باوەڕەی ، کە ئەمە بەڵگەیەکی گرنگتر و راستترە ( بۆ نیشاندانی پەیوەندیی کورد و ئەو میللەتانەی لە کاتی خۆیدا لەو ناوچەیە دەژیان ) ، وەك لەو بەڵگە جوگرافیی و ئەتنوگرافیی لاوازە بێ مانایانەی هەن ( ل ١٥ ) . بەر

له هەمو شتێك دەڵێین ، كە لەو باوەڕەداین شـتی وا نییـە لای یەزیدیـیەكان . ئەو نمونەیەی ئو. ل. ڤیاچێڤـكی نیشـانی داوە ، كە گوایا لە كتێبە ئایینیـیەكانی یەزیدییەوە هێناویەتیەوە راست نییە . وەك ئێمە ئاگـامان لێیە ، لای پیاوە ئایینیـیەكانی یەزیدییەكانیش شـتی وەها نییە و نەبووە . هەروەها پێویستە ئەوە لە بـیر نەكەین ، كە كتێبە ئایینیـیەكانی یەزیدی لە سـەدەكانی ( ١٠ ـ ١١ ) ی زایینـدا نوسراون ، بەڵام ئەو پادشایانەی ناویان هێنراوە پادشای بابـلی بوون لە پێش زایینەوە . لەبەر ئەوە سەیرە كە نوسەر دەڵـێ : یەزیدیـیەكان لە كاتی پادشایەتی ئەو پادشایانەدا ئەمەیان نوسیوە . ئەگـەر ئەوەی ئو. ل. ڤیلچێڤسكی دەیڵێت راسـت بێت ، ئەوە بە باوەڕی ئێـمە ئەوەی زیاتر لە راسـتییەوە نزیك بێت ئەوەیـە ، كە دانەرانی كتێبە ئایینیكانی یەزیدی ئەمەیان دروست كردوە و خستویانەتە نارەوە بەو مەرامەی نیشانی بدەن كە یەزیدیـیەكان میللەتێـكی جیاواز و ئازادی‌خوا و بە هێزن ، كە وا لە زۆردا خاوەنی ئەم پادشایانەی خۆیان بوون . . .

نوسـەر لە فەسڵی سـێیەمدا ( ل ٥٦ ـ ٦١ ) رای توراییـف و ن. أ. كیسیلیكۆڤ و ئی. م. دیاكونۆڤ نیشـان دەدات دەربارەی كۆمەڵی كۆیلەكان و دەوری بەكار هێنـانی ئەسپ لە ژیانی ئابوری میللەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا . لێرەدا چەند نمونەیەكی هێناوەتەوە كە دەوری ئەسپ نیشان دەدەن لە ژیانی كورددا ( ل ٤١ ـ ٤٢ ) . پاش ئەوە نوسەر دێتە سەر باسی مێژوی دەوڵەتی خاوەن كۆیلەكان ، كە وا لە زۆردا لە ناوچەكانی ئیستای كوردستاندا هەبو . پاش باسێكی دور و

درێژ له چۆنێتی دروست بونی دەوڵەتی خاوەن کۆیلەکان هاتۆتە سەر ئەم ئەنجامانە.« لەبەر ئەرەی ئەم مەسەلەیەی (مەسەلەی دروست بونی دەوڵەتی خاوەن کۆیلەکان له رۆژهەلاتی ناوەڕاست ـ ق کوردۆ) ئەتنوگرافیای کورد ـ کە یەکێکن له زمانە ئێرانێـکانی ئێستای ناوچە شاخاوێکان، کە ئاسیای بچوك و رۆژئاوای ئێران پێکەوە دەبەستێ ـ ناتوانرێ بکرێ بە بەڵگەیەك بۆ ئەوەی نیشان بدرێ، کە کورد له رەگەزی ئەو هۆزە ئێرانیانەن » (١٨) . ئەمەش ئاشکرایە، کە « هۆزە کوچەرییە شاخاوێکانی ئەم هەرێمە پەیدابون زۆر له پێش ئەوەی هۆزە کوچەرییە ئێرانێکان بێن بۆ ئەم هەرێمە له دروست بونی ئەم هۆزە شاخاوییە کوچەرانەدا تاسیری لایەك هەیە له کاروباری ناومال و دروست بونی کۆمەڵ و رەوشت و کولتور و هەتا لەزمانیشدا » (ل ٤٨) . له پاشا نوسەر لە کتێبەکەی ئی. م. دیاکۆنۆفەوە « مێژوی ماد » چەند بەڵگەیەك دەربارەی مادەکان دەهێنێتەوە (ل ٤٨ ـ ٥١) .

سەرنج و ئەنجامەکانی نوسەر بۆ فەسلی سێیەمی کتێبەکەی دەری دەخا، کە : « له ناوەڕاستی سالانی هەزاری پێش زایینندا، له دەمی له ناوچونی زوربەی دەوڵەتانی بەتەمەنی خاوەن کۆیلەکانی رۆژهەلاتی کۆن — ئورتو، ئاسوری، بابل ... له جێگای رۆخاوی ئەواندا دەوڵەتی خاوەن کۆیلەکانی نوێ — ماد — سازبو . پاش ئەو ئەخەمینی فارسی له ئەنجامی هاتنی هۆزە ئێرانێکان بۆ ناوچەکانی ئاسیای بچوك و رۆژئاوای ئێران کە تەنها تازە دەستی پێ کردبو، وە هێشتا له توانایدا نەبو کە گۆڕانێکی بە هێز روبدا له سنوری

ئەتنۆگرافیا و شێوەی زمانی دانیشتوانی ناوچە شاخاوییەکان » ....
« هەر لەو دەمەشدا بوو کە بەتەواوی شێوەی زمانە سامییەکان جێگیر بوو لە ناو گەلێك لەو دانیشتوانەی لە ناوچە شاخاوییەکاندا بە کشتوکاڵەوە خەریك بوون . هەروەها لەم ناوچەیەدا گەلێك هۆزی کۆچەری لە کۆنەوە دەژیان ، بەڵام ئەمان نەکەوتنە ژێر تاسیرەوە ، وە زمان و دیالێکتی خۆیان پاراست و هێشتەوە » ( ل ٥١ ) . بەداخەوە ، نوسەر بۆ چەسپاندنی ئەم ئەنجامەی گەیشتویەتێ هیچ بەڵگەیەکی زمانی و دیالێکتی نییە .

هەروەها لە فەسڵی چوارەمیشدا ( ل ٥٢ — ٦٦ ) هەر باوەڕی ئی. م. دیاکۆنۆڤ دەهێنێتەوە دەربارەی چوونی لەشکری ئاسوری بۆ ( زاموا ) لە ساڵانی ١٠٠٠ — ٩٠٠ ی پێش زایینندا ، وە دەربارەی دانیشتوانی ( مانا ) ( ل ٥٢ — ٥٩ ) . نوسەر لێرەدا بەڵگەکانی هیرادۆت و کەزنەفۆن نیشان دەدات دەربارەی کاردوخی کۆن ( ل ٦٠ — ٦٦ ) . لە لێکۆڵینەوەی بەڵگەکانی کەزنەفون دەربارەی کاردوخ ، ئو. ل. ڤیلچێڤسکی دەڵێ : کوردی ئێستا هیچ پەیوەندییەکی مێژوویی و زمانییان نییە لەگەڵ کاردوخ . بە باوەڕی ئەو کاردوخەکان « بە زمانێکی ناوچەیی نائێرانی دەدوان » ( لە خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە ) .

نوسەر لە فەسڵی پێنجەمدا ( ل ٦٧ — ٧٨ ) ڕای د. م. میخایلیس و أ. ل. شلیتیسر و چەند زانایەکی ئەوروپایی ، ڕای هەندێك زانای ڕوس : کۆنیك و پ. ئی. لێرخی نیشان داوە ، کە

دەڵێین — کورد بە ڕەگەز خالدییە و بە زمان ئێرانییە لە پاشا نووسەر تیۆری ن. یا. مارر و ف. ف. مینۆرسکی دەهێنێتەوە سەبارەت نەژاد و زمانی کوردی . لە لێکۆڵینەوەی ئەو تیۆرییەی کە ڕەگەزی کورد و زمانی کوردی بە یافیتی دادەنێ ، ئو. ل. ڤیلچێڤسکی لە ڕاســتیدا باوەڕە کۆنەکانی بەرامبــەر بە زمانی کوردی دووپات دەکاتەوە . جگە لەوە درێژەی پێ دەدا و تەشەنەی پێ دەکا و دەیەوێ بیچەسپێنێ کە زمانی کوردی لە یافیتیەوە دەستی پێکردوە و گۆڕڕاوە و پێشکەوتووە لە ڕێگای بوونیـدا بە زمانێـکی ئێرانی و لە دواییدا بە زمانێکی عەرەبی و دوا دەوری بە زمانێـکی تورکی . لە پاشا دێتە ســەر نیشاندانی تیۆرێـکەی ف. ف. مینۆرسکی دەربارەی ئەوەی ، کە ڕەگەزی کوردی ئێـــستا لە مادەوە هاتووە و دەربارەی پەیوەندی ئەتنۆگرافی کورد لەگەڵ میللەتانی کۆندا ؛ دەربارەی ئەو ناوەی بە مێژوو و بە فۆنێتیك پەیوەندی هەیە لەگەڵ هۆزی « بوتی » کوردی ، کە وا لە ناوچەی « بوهتان » جێگیر بوبوون . ف. ف. مینۆرسکی لەو باوەڕەدایە ، کە مادو میللەتانی کۆنی ئێران سەرچاوەی کوردی ئەمڕۆن و دەتوانرێ بوترێ زمانی کوردی لە مادەکانەوەیە . ئو. ل. ڤیلچێڤسکی دژی ئـــەم باوەڕە دەوەستێ و دەڵێ : نە بە چۆنێتی دروست بوونی کۆمەڵ ، نە بە زمان کورد لە نەوەی مادەکان نین .... « هەوڵدانی ف. ف. مینۆرسکی بۆ ئەوەی مەســەلەی ئەتنۆگرافیای کورد بکا بە مەســەلەی مادەکان .... بێ هێزە » ( ل ، ٨ ) . هەمان باوەڕی لە لاپـــەرە ٨٤دا بەم جۆرە دەربڕیوە : « چەنـد جارێك باوەڕێـکی وەهـا هاتۆتە کایەوە کە زمانی کوردی بە میدی دەداتە

قه‌ڵه‌م ، ئه‌م باوه‌ڕه له‌گه‌ڵ راستیدا ناگونجێ » .... ئه‌ویش له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له زانستدا ده‌رباره‌ی زمانی ماده‌كان هیچ شتێك ئاشكرا نییه ئو. ل. ڤیلچێڤسكی دژی ئه‌و باوڕه وه‌ستاوه كه ده‌ڵێ په‌یوه‌ندی ئه‌تنوگرافی و زمانی هه‌یه له نیوان كورد و ماددا . هه‌روه‌ها ئه‌و ده‌ڵێ له زانستدا هیچ شتێك ئاشكرا نییه ده‌رباره‌ی زمانی ماده‌كان ، كه‌چی له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا نوسیویتی : « له نیوان فارسه‌كان و ماده‌كاندا جیاوازییه‌كی وه‌ها نییه له ئه‌تنۆگرافیا و كولتور و زماندا » (ل ٨٢) له ئو. ل. ڤیلچێڤسكی ده‌پرسین : گه‌ر له زانستدا ده‌رباره‌ی زمانی ماده‌كان هیچ شتێك ئاشكرا نییه ، ئه‌ی چۆن نوسه‌ر ده‌نوسێ كه له نیوان فارسه‌كان و ماده‌كاندا جیاوازییه‌كی وه‌ها نییه له ئه‌تنۆگرافیا و كولتور و زماندا ؟ نوسه‌ر چی به‌ڵگه و بنچینه‌یه‌كی هه‌یه بو چه‌سپاندنی ئه‌م باوه‌ڕه‌ی ؟ ئه‌ی بۆچی ئه‌و باوه‌ڕه‌ی زمانی كوردی به میدی داده‌نێ له‌گه‌ڵ راستیدا ناگونجێ ؟ ئایا نوسه‌ر خۆی خۆی به‌درۆ ناخاته‌وه ؟ .

هه‌رچه‌نده ئه‌م هه‌ڵبه‌ز و دابه‌زه‌ی كردوه ، كه‌چی له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا له كۆتایی ئه‌م فه‌سڵه‌دا باوه‌ڕه‌كه‌ی ڤ. ف. مینۆرسكی ده‌رباره‌ی په‌یوه‌ندی كورد و ماد وه‌رگرتووه ، به‌ڵام هه‌ندێ ناته‌واوی هه‌ر لێ ده‌رده‌هێنێ . ئو. ل. ڤیلچێڤسكی له‌م باره‌یه‌وه نوسیویتی : « لێكۆڵینه‌وه‌كه‌ی ڤ. ف. مینۆرسكی راستیه‌كی ته‌واو ده‌رده‌خا له‌مه‌سه‌له‌ی نه‌ژادی میلله‌تی كورددا كه باسی هۆزه ئێرانیه‌كان ده‌كات ، كه وا هاتون بۆ ئاسیای بچوك ، به‌ڵام به باشی باسی ناكات ئه‌وه له چ كاتێكدا و به چ چه‌شنێك ده‌ستی پێكردوه و چۆن كه‌وتنه‌وه‌ی

کورد ڕوی داوە » ( ل ٧٨ ) .

لە فەسڵی شەشەمدا ( ل ٨ـ ٩٧ ) هەوڵی داوە نیشانی بدات کە چ کاتێك و پەیدابونی کورد چۆن بوە لێرەدا تەماشـــای بزوتنەوەی هۆزە کۆچەرەکان دەکات . لە کاتێکدا باسی لێکچونی چۆنێتی پێکهاتنی دەوڵەتی مـــاد و ئەخەمینی دەکات و لە چۆنێتی پێکهاتنی هێزی جەنگی و هۆزایەتی و ژیانی کۆمەڵایەتییان دەکۆڵێتەوە ، نوسیویەتی : « تا ڕادەیەك خاوەنی لە شکرێکی بە هێزی یەکگرتو بون » ( ل ٨٤ ) . درێژە بە باســـەکەی دەدا و دەڵێ : هاتنی هۆزە ئێرانییەکان بۆ ئاسیای بچوك لە زەمانی هـەرە کۆنەوە دەستی پێ کرد ـ واتە لە نێوان سەدەکانی ٧ ـ ٦ ی پێش زایینەوە . نزیکەی لە ماوەی هەزار ساڵی تەواودا ئەم ناوچەیە ( میسۆپۆتامیا ـ ق. کوردۆ ) ، کە زۆ لە ژێر تاســـیری ئەتنۆگرافیـا و کولتوری جیهانیکی سامیدا بو کەوتە ژێر تاسیری جیهانێکی ئێرانییەوە ... پەیدا بونی هۆزە ئێرانییەکان دەستی پێ کرد ، کە گرنگترین دەوریان بینیوە لە دروست بونی میللەتی کورددا ، لەبەر ئەمەشە زمانی کوردی بە زمانێکی ئێرانی دادەنرێ . هەروەها هۆزە ئێرانییەکان لە کولتوری کورددا دەورێکی گرنگیان بینیوە . لێرەدا نوسەر دەڵێ ، کە هۆزە ئێرانییەکان دەوری هـەرە گرنگیان بینیوە لە دروست بونی میللەتی کورددا . بەڵام تێ ناگەین نوسەر مەبەســـتی لە کێیە ، کە دەڵێ « هۆزە ئێرانییەکان » . گەر ئەو دژی ئەوەیە کە پەیوەندی لە نیوان کورد و ماددا هەیە ، وەك لە ســـەرەوە بینیمان ، ئەوە دەردەکەوێ

کە مەبەستی لە زاراوەی « هۆزە ئێرانییەکان » تەنها هۆزە فارسەکانە. گەر ئەمە وابێ ، پێویستە بڵێین ئەم تیۆرییەی ئو. ل. ڤیلچێڤسکی هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ تیوری مێژوو نوسە بۆرجوازییە فارسەکاندا ، کە نەژادی کورد بە فارس دادەنێن نوسەر کە دەڵێ : « هۆزە ئێرانییەکان گرنگترین دەوریان بینیوە لە دروست بونی کورددا » و هەروەها جگە لە هۆزە ئێرانییەکان هەندێ هۆز و میللەتی کەش هاوبەشییان کرد لە دروست بونی میللەتی کورددا . بەڵام تێ ناگەین ئەو هۆز ومیللەتانە کامانە بون ، کە وا هاوبەشییان کردووە لە دروست بونی میللەتی کورددا ؟ نوسەر لە لێکوڵینەوەکەیدا وا نیشانی دەدا کە ئەوانە هۆزە سامییەکان و میللەتانی ئەسڵی ئەم ناوچەیە و کاردوخەکان بون . وە بە باوەڕی ئەو کاردوخەکان ـ دانیشتوانی کۆنی کوردستان ـ لە حەوزانی زمانە ئێرانییەکان نەبون .

لە فەسڵی حەوتەمدا ( ل ۸۰ ـ ۱۰۵ ) باسی ئەو دەمە دەکا کە هۆزە ئێرانییەکان کەوتنە کۆچ کردن بۆ ناوچە شاخاوییە بڵندەکان . ئەم فەسڵەش هەر وەك فەسڵەکانی پێشو پڕکراوەتەوە بە هێنانەوەی نمونە لە نوسینەکانی ن. ف. پوکولێڤسکییەوە ، کە هەندێ بەڵگە دەدات دەربارەی چونی خێڵە ئێرانییەکان بۆ سەروی میسۆپۆتامیا ( ناوچەکانی کەرکوك و ئەربیل و سلیمانی ) لە سەدەی چواردەی پێش زایینda . لەم فەسڵەدا ئو. ل. ڤیلچێڤسکی شەرحی ناوی هەندێ هۆزی کورد دەکات ( گەرهەر ، بەرزان ، جاف ، هەمەوەند ... ) . باسی خاسیەتی چۆنیێتی دروست بونی کومەلایەتییان دەکا و دەڵێ : ئەو هۆزانە ، بە تایبەتی هۆزی هەمەوەند چ بە زمان ، چ بە

کولتور و شێوەی ژیانی کۆمەڵایەتییان پێکهاتوون لە کولتورێکی تێکەڵاوی کوردی ـ عەرەبی سەروی میسۆپۆتامیا (ل ٩٨ ـ ١٠١). لە پاشا نووسەر دێتە سەر تەماشاکردنی نزیکایەتی لە چۆنێتی پێکهاتنی کۆمەڵایەتی لە نیوان هۆزەکانی کورد و تورکدا. باوەڕی ن. یا. مارر دەکا بە نموونە و دەڵێ: «لە پاش دەوری مەغۆل، لە یەکێتی هۆزەکانی کورد دروست بوونێك پێکهات. ئەو یەکیتیە ـ پێکهاتنێکی جەنگی بوو، کە چ بە شێوە و چ بە زاراوەکانیدا نزیك بوو لە پێکهاتنی هۆزەکانی تورك» (ل ١٠٣). دوا بە دوای ئەمە نووسەر ناوەرۆکی نووسینەکەی ن. یا. مارر دەخاتە پێش چاو کە لە وتاری «دیسان دەربارەی وشەی چەلەبی»دا بڵاوکراوەتەوە. لێرەدا دەڵێ: لە ریگای هەوڵ و تەقەلای ن. یا. مارەوە توانراوە کە مێژووی کولتور و دەوری کورد لە مێژووی میللەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە پێشخستنی دەرەبەگایەتی و ئەتنۆگرافیای ئەمڕۆی تورکەکانی ئاسیای بچووکدا یەکلابکرێ» (ل ١٠٤ ـ ١٠٥).

فەسلی هەشتەم (ل ١٠٦ — ١١٦) ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەی نووسەرە دەربارەی مەسەلەی ئەتنۆگرافیای میللەتی کورد. لەم فەسلەدا بەکورتی باسی هۆی گۆڕانی دەوڵەتەکانی ماد و ئەخەمەنی و پارفیان و ساسان دەکات؛ دەربارەی خەباتی پارفیان و ساسان دەدوێ «کە بووە بە هۆی گۆڕینی شێوەی دانیشتوانی ناوچە شاخاوییەکانی سەروی میسۆپۆتامیا». دوایی دێتە سەر روون کردنەوەی مانای کۆمەڵایەتی و ئەتنۆگرافی ئەم وشانە: کورد، کۆرد، کارد، کاردوخ، کورد و دەڵێ کە لە نیوان ئەم وشانەدا هیچ جۆرە

پەیوەندییەکی مێژوویی و ئەتنۆگرافی نییە و وشەی (کورد) وەك ناوی ئەتنۆگرافی میللەتێك لە دەوری دەوڵەتی ساسانییەکاندا پەیدا بو .
نوسەر سورە لەسەر ئەو باوەڕەی کە گوایا کورد ، وەك میللەتێك خاوەن زمانێکی جیاواز دروست بووە لە کۆتایی لەناوچونی دەوڵەتی ساسانییەکاندا و لە سەرەتای پەیدا بونی عەرەب لە ناوچە شاخاوییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا (ل ١١٤) .

ئەنجام و سەرنجەکانی نوسەر وای دەردەخەن کە : « لە جەرگەی کوردستانی ئێستادا لەسەرخۆ و لەسەر بنچینەی خێڵاتی کۆچەری جیاواز ، کە لە ژێر تاسیری ئێراندا بون میللەتی کورد دروست بو . ئەم سازبونە لە نیوان سەدەکانی ٦ — ٢ پ . زایینیدا روی‌داوە ـ واتە لە دەوری فەرمانڕەوایی پارفیان و ساسانییەکاندا ، کە لە و دەمەدا خێڵە ئێرانییەکان لە دروست‌کردنی هێزی جەنگی خێڵایەتیدا دەورێکی گرنگیان لە ژیانی سیاسی ئاسیای بچوکدا بینیوە » (ل ١١٦) . ئایا ئەم ئەنجامانەی نوسەر شتێکی نوێیە و جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو ئەنجامانەی دەربارەی رەگەز و دروست بونی میللەتی کورد نیشانی دابو ؟ بەداخەوە ئەمانە نوێ نین ، بەڵکو هەر ئەو شتانەن کە زۆ لە وتاری « کورد » دا نوسیبوی و ئێستا دوبارەی دەکاتەوە . لە وتاری « کورد »دا لەم بارەیەوە نوسیویتی : « لە دروست بونی میللەتی کورددا خێڵەکانی جیاوازی زۆی زاگرۆس (کاردوخ ، کورت ، کاسی ، لولوبی ، داسنی ) و ئێرانی (ماد ، پارفیان ، فارس) هاوبەشییان کردوە . لە دەوری هەرە کۆنی مێژودا لە دروست بونی کورددا ، عەرەب و ئاسوری و ئەرمەنیش دەوریان هەبووە . وا

دیاره لە دەمی ساسانیێکاندا بە تەواوی دەوری دروست بوونی میللەتی کورد کوتایی هات و بوو بە زمانێك لە زمانەکانی رۆژئاوای ئێران ، کە نزیکە لە زمانی فارسییەوە » ( ل ٢٤٤ ) .

لەو باوەڕەداین و بۆ هەموان ئاشکرایە ، کە وێکچوون و جیاوازیی لە نێوان ئەو ئەنجامانەدا نین کە ئو. ل. ڤیلچێڤسکی لە وتاری « کورد » دا و لە کتێبەکەی سالی ١٩٦١ یدا دەربارەی ئەتنۆگرافیای میللەتی کورد گەیشتوویەتی وا دەزانین کە هیچ جیاوازییەك نییە ، گەر ئەو جیاوازییە بە جیاوازی نەژمێرین کە دەوری دروست بوونی میللەتی کورد دەخاتە کاتێکی دوورتر ، واتە لە دەمی لەناوچوونی حکومەتی ساسانیێکان و دەست پێکردنی پەیدابوونی عەرەب لە ناوچەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا ( سەدەی حەوتەم ) .

بەم جۆرە دەبینین ـ لە ڕێگای هێنانەوەی نموونەی ئاشکرا لە زانستدا دەربارەی کۆمەڵی خاوەن کۆڵەکان ؛ لە ڕێگەی نیشاندانێکی زۆر لە بیر و باوەڕی هەندێك لە زانایان دەربارەی دروست بوونی کومەڵ و سیاسەتی میللەتان و هۆزانی جیاوازی زۆ ، کە لە ناوجەرگەی کوردستانی ئێستادا جێگیر بوو بوون ؛ لە ڕێگای بەراورد کردنی هەندێ بەڵگەی مێژوویی و کۆمەلایەتی و کولتوری ؛ هەروەها لە ڕێگای بیر و باوەڕێکی شێواو و نەگونجاو و بێ هیچ بەڵگەیەکی زانستی و لە سەر بنچینەی تیۆرییەکی چەوت و ناڕاست ویستوویەتی پەیوەندیی کورد لە گەڵ میللەتانی دراوسێیدا نیشان بدات . ئەو باوەڕەی زانایان هەیانە دەربارەی ئەوەی کە هیچ بەڵگەیەك نییە بۆ نیشاندانی پەیوەندیی ئەتنۆگرافی و زمانی لە نێوان

کوردی ئێستا و خێڵە سامێکان و عەرەبەکان و یافیتی و تورکەکاندا نوسەر بە راستی نازانی و هەوڵ دەدا بە هەچی چەشنێك بێت لە ناو کورددا شتێك هەر بدۆزێتەوە ، کە لەو رێگایەوە کورد بکا بە خزم لەگەڵ ئەو میللەتانەی ناومان بردن . ئو ل ڤیلچێڤسکی دژی باوەڕی راست و چەسپاوی ئەو زانایانە وەستاوە ، کە کوردی ئێستا بە نەوەی ماد و کاردوخ دادەنێن نوسەر بۆ ئەو دژ راوەستاندنەی هیچ رۆن کردنەوە و بەڵگەیەکی نییە . لە سەرەوە بینیمان کە چەند ناتەواوی و کاڵ و کرچی و لاوازی هەیە لەو باوەڕیـــدا کە دژی تیۆرێکەی ف . ف . مینۆرسکی وەستاوە بۆ نیشاندان و رۆن کردنەوەی زۆری کەم و کورتی بەسە گەر تەماشای لێکۆڵینەوەکەی بکەین لە بەڵگەکانی کەزنەفون دەربارەی کاردوخەکان ، کە چۆن بە ئاشکرایی نوسەر لەو لێکوڵینەوە ئاسانەدا ئەو هەمو هەڵەیەی کردوە .

* * * * * *

# سەرنجێك لە نوسراوەکەی ئاکۆپۆڤ

## رەخنەی مێژوویی لە مەسەلەی نەژادی کوردا

کاتێـك لە نـامەی دوکتۆری ك. ب. ئاکـۆپۆڤ (١) کـۆڵرایەوە ، لە بەشـی کوردی ئامۆزگـای رۆژهەڵاتناسـی لە لینینگراد . مامۆسـا ق. کوردۆ بەم وتارە بیر و رای خۆی دەربڕی ( وەرگێڕ ) .

ساڵی پار ، لە بەشـی مێژوو ، لە ژێر چـاودێری ن. ڤ. پێگۆلیۆڤسکەیا لەم نوسراوە کـۆڵینەوە . لەم لێکۆڵینەوەیەدا گەلێك لە زانـایانی ئامۆزگەکەمان : ن. ڤ. پێگۆلیۆڤسکەیا ، ڤ. أ. لیڤیشیتس ، س. أ. کلیاشتۆرنی ، ق. کوردۆ هاوبەشییان کرد . ددانیان بەوەدا نا کە نوسراوەکەی ك. ب ئاکۆپۆڤ لە رووی زانیارییەوە ئێجگار لاوازە ، گەلێك نـاتەواوی و هەڵە و چەوتی تێدایە . داوایان لە نوسەر کرد سـەرلەنوێ لە بنەڕەتەوە ، بە شێوەیەکی تر بینوسـێ و هەمـوو کەم و کورتیـەکانی پڕبکاتەوە و چەوتیەکانی راست بکاتەوە .

پاش ماوەیەك ، بۆ جاری دووەم کارەکەی ك.ب. ئـاکۆپۆڤ

(١) کوردناسێکی سۆڤیێتیە لە یەریڤان ( وەرگێڕ ) .

ئێررا بۆ ئامۆژگای ئێمە . ئەم جارە بەڕێوەبەرانی ئامۆژگاکەمان داوایان لەبەشی کوردیی کرد لەم نووسراوە بکۆڵنەوە و بەپێی سەنگی خۆی نرخی بۆ دابنێین .

ئەم نووسراوە پتر لە ٥٠٠ لاپەڕەی چاپکراوە . مەبەستی نووسەر لە لێکۆڵینەوەیەدا ، وەك خۆی دەڵێ ئەوەیە : لەسەر رێگایەکی زانستی مێژوویییەوە رەخنە دەگرین و دەکۆڵینەوە لەو باوەڕانەی هەن دەربارەی نەژادی کورد .

بەم جۆرە مەبەستی نووسەر ئاشکرایە : لێکۆڵینەوە و رەخنەیە لەو تیۆرییە جیاوازانەی دەربارەی نەژادی کورد هەن .

نووسەر لە لێکۆڵینەوەکەیدا گرنگی داوە بە زانیاریی مێژووی دوور لە بەڵگەی سەدەکانی ناوەڕاست و بەتیۆری بۆرجوازی وهیند و ئەوروپایی و یافیتی وسامی و شۆفینیستی ئێرانی و تورکی دەربارەی نەژاد و زمان و کولتوری میللەتی کورد .

ك. ب. ئاکۆپۆف بۆ ئەم نووسراوەی گەلێك سەرچاوەی هەمە چەشنەی بەکارهێناوە ، کە بە زمانەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا نووسراون . لە ناو ئەم سەرچاوانەدا زۆر نووسراوی گرنگ هەیە ، بەڵام بەداخەوە پەیوەندییان لەگەڵ لێکۆڵینەوەکەی نووسەردا نییە . جگە لەو نووسراوە گرنگانە هەندێ نووسراوی لاوازی دوور لە زانیاریی بەکار هێناوە ، کە بە هیچ جۆرێك پەیوەندییان نە لەگەڵ باسەکەی ئەودا و نە لەگەڵ زانستی مێژوودا نییە . ئەو سەرچاوانەش ئەو نووسراوانەن کە بێ هیچ بەڵگە و چەسپاندنێك دەربارەی نەژادی کورد دەدوێن ،

یاخود باسی پەیوەندیی کورد و میللەتانی دراوسێیان دەکەن .
زوربەی ئەو سەرچاوانە نوسراوی زانایان و مێژوونوسان نین ، بەڵکو شتێکن کە بە ڕێکەوت نوسراون لە لایەن هەندێك کەسەوە وەك : عارف ، بەزاز ، کۆرسێل ... هتد .

نوسەر دەڵێ : گرنگی ئەم نوسراوەی من لە وەدایە ، کە لەم باسەدا پتر لە هەموو ئەو نوسراوانەی هەن دەربارەی کوردناسی شتم دۆزیوەتەوە و دەرخستوە و ڕوونکردوتەوە « لەو شوێنانەدا ، کە لەو باوەڕەدام کەس نەیتوانیوە هەستی پێ بکا و بیدۆزێتەوە ، وەك لە نوسراوەکانی ( فیردەوسی و رافی و ف. سکۆت و ئۆلدریج و شەگانیان )دا ؛ لە یاداشتی گەڕۆکەکاندا ؛ لە راپۆرتی فەرمانگە سیاسی و جەنگێکاندا » ( نامەی دوکتۆری ، ل ١٢ ) .

ئەم وشانەی نوسەر تەنها قسەی زلن . ئەگینا ئێمە لەو باوەڕەداین ، کە وا سەرچاوەی ئەدەبی و یاداشتی گەڕۆکەکان و راپۆرتی فەرمانگاکان ناتوانن ببنە کەرەستەیەك بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی نەژادی میللەتی کورد ، کە پشتیان پێ ببەسترێ .

بەشێکی زۆر لە نوسراوەکەی گ. ب. ئاکۆپۆف لێکۆڵینەوەیە دەربارەی مێژووی ئەتنۆگرافیای میللەتی کورد و دۆزینەوەی شوینەوارە ( اثار ) لە کوردستاندا . بۆ ئەم باسە لە نوسراوەکەدا ئەم بەشانە هەن .

مێژووی کوردناسی لە لایەن ڕوسەوە ( نامەی دوکتۆری ، ل ٣٤٩ — ٢٦٨ ) ؛ لێکۆڵینەوە لە کورد لە لایەن ئەوروپاییەکانەوە ( نامەی دوکتۆری ، ل ٩٧ — ١٢١ ) ؛ مێژووی لێکۆڵینەوەی

شوێنەواری لە کوردستاندا ( نامەی دوکتۆری ، ل ٣٠٤ — ٣١٥ ) ؛ مێژووی لێکۆڵینەوە لە کورد لە لایەن زانایانی مێژوو و ئەتنۆگرافی ئەرمەنەوە ( نامەی دوکتۆری ، ل ٢٥٢ — ٢٧٥ ) ؛ هەروەها لە تیۆرییەکەی ن یا ماررێش کۆڵیوەتەوە ( نامەی دوکتۆری ، ل ٤١١ — ٤١٧ ) . ئەم بەشانە هیچ پەیوەندییەکی راستەوخۆیان نییە لەگەڵ باسەکەی نووسەردا . کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بە شێوەیەکی ساکار ، بێ لێکۆڵینەوەیەکی زانستی باسیان دەکات . لە لێکۆڵینەوەی ئەم بەشانەدا هیچ شتێکی دەرنەخستووە و بەڵکو هەر ئەوە دەچێ ، کە ناوی هەندێ سەرچاوەی هێنابێ .

هەروەها ئەم بەشانەی خوارەوەش پەیوەندییان لەگەڵ ناو و باسی نووسراوەکەدا نییە : مێژووی شێواندنی شۆڤێنیێتی تورکی (ل ٤٢٦ – ٤٥٣ ) . نووسەر لەم بەشەدا باسی مێژووی پەیدابوونی شۆڤێنیێتی تورکی دەکات . کۆڵیوەتەوە لە تیۆری جیاوازی مێژوونووسانی تورك ، لەو بارەیەرە کە حیتی ، میتانی ، سۆمەری بە « باو و باپیری راستەوخۆی ئەمڕۆی تورکە شارستانییەکان — باو و باپیری نەتەوەی تۆرانی مەزن » دادەنێن ... هتد . هەر بەو شێوەیەش گەلێك لاپەڕە و سەر ئەنجام ، کە پەیوەندی راستەوخۆ و نزیکیان نییە لەگەڵ باسەکەی نووسەر و لەگەڵ بەشەکانی نووسراوەکەدا . بە تایبەتی لێکۆڵینەوە بۆ شەرمانەکەی دەربارەی دروست بوونی میللەتی کورد (ل ٥٣٠ — ٥٥٠ ) .

گەلێك لاپەڕەی نووسیوە لەسەر لێکدانەوەی هەندێ ئەفسانەی جیاوازی کوردی و عەرەبی و فارسی دەربارەی نەژادی کورد .

نوســەر بە دوور و درێژی ، بە شـێوەی جیاواز ناوەڕۆکی ئەو ئەفســانانەی نوسیوە ، کە لە رەشید یاسمی و شەرەف خانی بتلیسی و عەلائەدین سەجادەیەوە وەری گرتوە . گ. ب. ئاکۆپۆف ویستویەتی لە رێـگای ئەم ئەفسـانانەوە راستی خۆی دەربخات . نوسیویتی : « هیچ یەکێك لەم سەرگوزشتە و داستانانەی سەدەکانی ناوەڕاست بە خۆرایی هەڵبەسـتراون . رەگیان دەگەڕێتـەوە بۆ زۆر کۆن . لێرەدا لێکۆڵینەوە لە ئەفسانە و سەرگوزشتە و داستان بۆ رون کردنەوەی رەگەزی کورد دەوری خۆی دەبینێ » .

لەگەڵ ئەم جۆرە باوەڕانەدا رێك ناکەوین . راستە سەرگوزشتە هەن ، کە روداو و بەڵـگەی مێژوویین ، بەڵام سەرگوزشـتەش هەن کە هەڵبەستراون و رێكخراون بەکوێرەی پێویســتی چەرخ . ئەو جۆرە سەرگوزشتە و داستانانە ناتوانن ببن بە بەڵـگەی مێژوویی بۆ لێکۆڵینەوەی باسێکی زانستی . نوسەر جیاوازی لە نیوان ئەفسانە و سەرگوزشتە و داســتانی راست و ناڕاستدا نابینێت . هـەر لەبـەر ئەوەشە گەلێك لایەڕەی پڕکردوتەوە بەو ئەفسانانەی کە دەڵێن کورد لە شەیتانەوە پەیدابون .

ئەوەی پەیوەندی هەیە بـــە باســـەکەوە ، بەشی رەخنەیە کە دەکۆڵێتەوە لە تیۆری جیاواز : سامی ، عەرەبی ، تورکی ، یافیتی دەربارەی نەژادی کورد . لەم رووەوە ئەمانەوێ بڵێین .

وەك ئاشکرایە ، تیۆری زانایانی رۆژهـەڵات و ئەوروپا ، کە رەگەزی کوردیان بە عەرەب دانابو لە مێژە لە لایەن کوردناسانەوە

لەناو براوە. سەبارەت بەم باسە گەلێك كتێب و وتار هەن، كەچی گ. ب. ئاكۆپۆڤ لە ئەفسانە و داستان دەكۆڵێنەوە و كەچی لەو كتێب و وتارانەی هەن بۆدەنگ تێدەپەڕێ.

ئەو تیۆرییەی، كە رەگەزی كورد بە فارس دادەنێ ئەویش بە رەخنەی كوردناسەكانمان سەرەولێژ كراوە، بەتایبەتی لە وتارەكەی مندا «شێواندنی مێژوی كورد لە زانستی مێژوی بۆرجوازی فارسدا»، كە لە كتێبی ـ نامەی زانایانی زانكۆی لێنینگرادا، لە سالی ١٩٥٤دا بڵاوكراوەتەوە. لەم وتارەدا رەخنە لە كتێبەكەی رەشید یاسمی «مێژوی نەژاد و پەی وەستەگی كورد» گیراوە. گ. ب. ئاكۆپۆڤ گرنگی زۆری داوە بە رەخنەگرتن لە رەشید یاسمی و مێژونوسانی تری فارس دەربارەی نەژادی كورد. رەخنەی گ. ب. ئاكۆپۆڤ بۆ نوسەرانی فارس، كە مێژوی نەژادی كوردیان شێواندوە و وەرچەرخاندوە هیچ شتێكی تازە نییە، بەڵكو هەر دوپات كردنەوەی ئەوەیە كە كوردناسانی ئێمە بڵاویان كردۆتەوە، بەتایبەتی بۆ رەخنەی رەشید یاسمی.

ئەوەی لە جێگای خۆیدا بێت ئەو بەشەیە، كە رەخنەی گرتوە لە مێژوناسانی تورك كە مێژوی نەژاد و زمانی كوردییان شێواندوە. پێش گ. ب. ئاكۆپۆڤ كەس لەم باسە نەدواوە. لەم بەشەدا كارێكی بەكەڵكی خاوكردۆتەوە.

ئەوەی كەم و كورتی بێت لە بەشی رەخنەدا، كە گرتویەتی لە مێژونوسانی عەرەب و تورك و فارس لە سەر ئەوەی مێژوی

نەژادی کوردیان وەرچەرخاندوە ، ئەوەیـــە کە گ ب. ئاکۆپۆڤ رەخنە دەگرێت لێیان نەك لەسەر بەڵگەی زانیاری و هێنانەوەی نموونەی تازەی زانستی ، بەڵکو رەخنەی تەنها لە رێگای ئەو نموونە ئاشـــکرایەوەیە کە دەسـتەی بەرێوەبەرانی ئێران و تورکیـــا بەم تیۆرییە ویستویانە میللەتی کورد لە ناو خۆیاندا بتوێننەوە.

گ. ب. ئاکۆپۆڤ وا دەداتە قەڵەم ، گوایا ئەم یەکەم کەسە ، کە بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوی نەژادی کورد ، نوسراوی نوســەرانی رۆژهەلاتی بەکار هێناوە. بەم بۆنەیەوە نوسیویتی : « شتێکی سەیرە کە لە کوردناسی ئەوروپادا نزیکەی هیچ نوسراوێکی ئەرمەنی ، تورکی ، کوردی ، فارسی ، عەرەبی بەکار نەهێنراوە » ( نامــەی دوکتۆری ، ل ١٣ ـ ١٤ ).

ئەم وتانەی نوســەر لە راســتییەوە دورن ، بەڵکو بە پێچەوانەوە ، زوربەی زانا گەورە ئەوروپاییەکان هەردەم سودیان لە لێکۆڵینەوە و نوسراوەکانی رۆژهەلاتیـکان وەرگرتوە ، بە تایبەتی لە نوسراوەکەی شەرەف خانی بتلیسی . گەردستەی لێکۆڵینەوەی هەمو کوردناسانی بەناوبانگی نیوەی یەکەمی سەدەی بیسـتەم نوسراوەکانی رۆژهەلاتیـکان . بۆ نمونە : ڤ. ف. مینۆرسکی ، لە لێکۆڵینەوەکەیدا دەربارەی کورد زۆر نوسراوی نوسەرانی عەرەب و تورك و کوردی بەکار هێناوە ؛ ڤ نیکیتین لە لێکۆڵینەوەکەیدا ـ « کورد » ، گەلێك ســـەرچاوەی رۆژهەلاتیـکانی بەکار هێناوە ( ل ١٧ ـ ١٨ ، ٢٣ ، ١٧٨ ـ ١٨٢ ، ٢٩٢ ، ٢٢٣ ـ ٣٢٦ .... هتد ) . ئەوەش دەخەینــە

پێش چاو ، کەکۆ ب. ئاکۆبۆڤ گەلێك بەڵگەو سەرچاوەی رۆژهەلاتێکانی لە کتێبەکەی ف. نیکیتینەوە وەرگرتووە .

نوسراوەکەی توما بوا زیکەی هەموی دەربارەی ئەتنۆگرافیاو زمان و ئەدەبی میللەتی کوردە و کەرەستەی نوسینەکەی نوسراوی نوسەرانی عەرەب و کوردە . وتارەکەی ماکەنزی « مێژوی نوسراوە کوردیێکان » بە زۆری لەسەر بنچینەی کەرەستەی زانا کوردەکان نوسیوە . خۆ کوردناسانی سۆڤیێت ( ئو. ڤیلچێڤسکی ، ق. کوردۆ ، ئی. تسوکەرمان ، م. رودێنکۆ .... هتد ) هەردەم رێزی لێکۆڵینەوەی رۆژهەلاتێکانیان گرتووە .

پێویستە ئەوە لەبیر نەکەین ، کە بۆ نوسینی کارێکی زانستی تەنها زانینی زمانی بێگانە مەرج نییە ، بەڵکو مەرج ئەوەیە — نوسەر بتوانێ باش لە نوسەرێکی بێگانە بگات ، وتەکانی نوسەرە بێگانەکە بەڕاستی وەرگێڕێتە سەر زمانەکەی خۆی و چەوتی و وەرچەرخاندنی تێدا نەکا و باوەڕێکی خۆی دەرنەبڕێ و بیکا بە باوەڕی ئەو .... بەداخەوە ئەم جۆرە چەوتی و وەوچەرخاندنە لەم نوسراوەی کۆ ب. ئاکۆبۆڤدا ئێجگار زۆرە .

چەند نمونەیەك دەهێنینەوە :

دەربارەی وشەی ( کاردوخ ) رەشید یاسمی نوسیویتی : « رەنگە کەزنەفۆن ناوی ئەم هۆزەی بەرگوێ کەوتبێ لە وتووێژی یەکێکی ئەرمەنەوە . وەك چۆن ( ك ) — دوا دەنگی وشەی ( کاردوخ ) لە زمانی ئەرمەنیدا نیشانەی کۆیە ( لە کتێبەکەی رەشید یاسمیدا ،

بەرۆسی ل ١٤٨) . کەچی گ. ب. ئاکۆپۆف ئەم چەند وشەیەی رەشید یاسمی بەم شێوەیە دەربڕیوە : « ئەو (کەزنەفون – ق. کوردۆ) . داوا لە وەرگێڕە ئەرمەنییەکە دەکا ... » ( نامەی دوکتۆری ل ٢٨٩) بەم جۆرە گ. ب. ئاکۆپۆف بە وەرچەرخانـدنی ئەو نموونەیەی لە رەشـید یاسمییەوە هێناویێتیەوە شتێکی تازەی دروست کردوە . بەم وەرچەرخانـدنە وا دەردەچێ کە یونانەکان وەرگێڕی ئەرمەنییان هەبووە .

لە لاپەرە ١٦ی کتێبەکەی نادۆ مەحودۆف « میللەتی کورد » ، کە بە زمانی ئەرمـەنی دەرچوە ، باسی زمانی کوردی دەکا و لە وتارەکەی من « شێواندنی مێژوی کورد لە زانستی مێژوی بۆرجوازی فارسـدا » کەڵکی وەرگرتوە و ناوی وتارەکەی منی هێناوە . نادۆ مەحودۆف لە وتارەکەی منـەوە ، بەم شێوەیە ئەم چەند دێڕەی وەرگرتوە :

« هەرچەندە گەلێك وشـە هەن لە زمانی فارسی و کوردیدا وێکدەچن ، بـەلام لەگەڵ ئەوەشـدا زمانی کـوردی زمانێـکی جیاواز و سەربەخۆیە و یەکـێکە لە پەلی رۆژئاوای زمانە ئێرانیەکان . چ بە فۆنێتیك و مورفۆلۆژی ، چ بە سینتکیس و پەیدابونی وشە ، زمانی کوردی بەهیچ جۆرێك ناتوانرێ بژمێررێت بە زمانێك ، کە لە فارسییەوە پەیدا بوبێت . حالەتی گراماتیکی وشەکانی زمانی کوردی خۆی لە ناو خۆیدا پەیدا بووە ، بە یارمەتی پێشگر و پاشگر و دۆبارە و شێوەی ریزکردنی وشەکان لە رستەدا ... » .

«چ بە شێوەی دەنگ ، چ بە ژمارەی دەنگەکان جیاوازی زۆرە لەنێوان فۆنێتیکی زمانی کوردی و فۆنێتیکی زمانەکانی تری ڕۆژئاوای ئێراندا ، بە تایبەتی لەگەڵ زمانی فارسیدا» .

لەم چەند دێڕەی سەرەوەدا ڕوونە و بە باشی دیارە کە بەهیچ جۆرێك ، وشەیەك چییە نەوتراوە دەربارەی پەیوەندی لە نێوان فۆنێتیکی زمانی کوردی و فۆنێتیکی زمانی ئەرمەنیدا ، یاخود نەوتراوە کە زمانی کوردی لە خێزانی زمانە ئێرانییەکان نییە .

کەچی گ. ب. ئاکۆپۆڤ ئەم چەند دێڕەی کتێبەکەی نادۆ مەخمودۆڤ ، کە لە وتارەکەی منەرە وەری گرتووە بەم شێوەیەی خوارەوە هەڵگێڕاوەتەوە : «هەرچەندە نادۆ مەخمودۆڤ کوردی بە نەوەی ماد داناوە و زمانی کوردی بە زمانێکی ئێرانی ژماردووە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەری خستوە کە فۆنێتیکی کوردی لە گەڵ فۆنێتیکی فارسیدا جیاوازە . هەروەها نیشانی داوە ، کە لێکچوون و خزمایەتی هەیە لە نێوان زمانی کوردی و زمانی ئەرمەنیدا و ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی نیشانی بدەین ، کە زمانی کوردی لە ریشەدا زمانێکی ئێرانی نییە» ( نامەی دوکتۆری ل ٤٠٤ ) .

بۆ ئێمە ئاشکرا نییە ، ادۆ مەخمودۆڤ مەبەستی ئەوە بووە بڵێ زمانی کوردی لە خێزانی زمانە ئێرانییەکانە یان نا ، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە و باش ڕوونە ، دەربارەی لێکچوون و خزمایەتی لە نێوان فۆنێتیکی زمانی کوردی و ئەرمەنیدا ، یەك وشە چییە نەی وتوە . ئەو چەند دێڕەی سەرەوە ، کە هانیومانەتەوە بە تەواوی

ئەم راستیەمان بۆ دەردەخات .

بە باوەڕی گ. ب. ئاکۆپۆڤ فۆنێتیکی کوردی دوورە لـە فۆنێتیکی زمانە ئێرانییەکان ، وا دادەنێ کە فۆنێتیکی کوردی و ئەرمەنی وێکدەچن ، بە باوەڕی ئەو کورد ئێرانی نییە . جا ئـەم باوەڕانە خۆی کە هەیەتی دەیکا بە باوەڕی نادۆ مەحمودۆف .

لە لاپەڕە ٥٠٦ دا گ. ب ئاکۆپۆڤ نووسیویەتی : وشـەی کورد مانای هۆزی کۆچەر دەبەخشێ ، کە پێکهاتوون لە میللەتانی جیاواز . نووسەر وای نیشان داوە کە ئەم باوەڕەی لە لاپەڕە ١٠٧ ی کتێبەکەی رەشید یاسمیەوە وەرگرتووە . گ. ب. ئاکۆپۆڤ نووسـیویەتی : « هەر ئەو پۆلە کۆچەریانەن کە هەندێ جار پێیان دەڵێن کورد و هەندێ جار تورك و هەندی جار قەرەج » . « لەبـەر ئەوەشـە دەگونجێن لەگەڵ باوەڕی رەشید یاسمیدا ، چونکە لە وشـەی (کورد) لەسەرچاوەکاندا مەبەستیان لە میللەتیکی خاوەن ئەتنۆگرافیا نییە ، بەڵکو مەبەست لە هۆزە جەنگاوەرییە کۆچەرەکانی ئێرانە » .

لێرەشدا گ. ب ئاکۆپۆڤ ئەو باوەڕی خۆی کە هەیەتی ـ واتە ئەو باوەڕەی وای دادەنێ گوایا وشەی کورد مانایەکی ئەتنۆگرافی نییە دەیەوێ لە ڕێگای نووسەرێکی گەوە دەربڕێ . ئەو نووسەرەش رەشید یاسمیە ، کە کورد بە فارسی شاخاوی دەدانە قەڵەم و کـە تۆوی شۆڤینیێتی فارسی بڵاودەکاتەوە .

گ. ب. ئاکۆپۆڤ تەنها ئەو شتانەی لە رەشـید یاسمیەوە وەرگرتوە ، کە توانیویەتی سوودی لێببینێ بۆ بیر و باوەڕە چەوتەکەی

خۆی . بەتایبەتی بۆ ئەوەی نیشانی بدات ، کە وشەی « کورد » مانای دانیشتوانی کۆچەری ئێران دەبەخشێ . بەڵام گ. ب. ئاکۆپۆڤ بیری نەکردۆتەوە لە شۆڤێنیێتی رەشید یاسمی و بە لای ئەوەوە گرنگ نییە بۆچی بەو جۆرە مانای وشەی « کورد » ی لێك داوەتەوە . ئێمە باش تێدەگەین کەمەبەستی رەشید یاسمی چییە ، بەڵام نازانین مەبەستی گ. ب. ئاکۆپۆڤ چییە کەدەڵێ وشەی « کورد » مانایەکی ئەتنۆگرافی نییە ؟ .

لێکۆڵینەوەی گ. ب. ئاکۆپۆڤ لە زمانی کوردی و پەیدابوونی بەرامبەر هیچ رەخنەیەك خۆی ناگرێت .

نوسەر زۆر باسی وێکچوون و پەیوەندی زمانی کوردی لەگەڵ زمانانی میللەتانی دراوسێدا دەکات ، سەرچاوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەی نوسراوی ئەو نوسەرانەن ، کە شارەزای زمانی کوردی نین - واتە ئەو نوسەرانەی لە رێگای نەشارەزاییەتیانەوە لە گەلێك بەڵگە بە هەڵە دواون . گ. ب. ئاکۆپۆڤ ئەم جۆرە سەرچاوانەی بەکار هیناوە بۆ نوسینی : وێکچوونی زمانی کوردی و هیندی ( ل ٤٠٩ ) ، لێکچوونی زمانی کوردی و ئەرمەنی ( ل ٤٠٤ ) ، لێکچوونی زمانی عەرەبی و کوردی ( ل ٧٢ - ٧٥ ) ، وێکچوونی زمانی جۆرجی و کوردی ( ٣٨٢ - ٤٠٤ ) ، لێکچوونی زمانی کوردی و تورکی ( ل ٤٧٠ - ١٨٠ ) .

لەکاتی خۆیدا ب. ف. میللیر و ئۆ. ل. ڤیلچێفسکی هەندێ شتیان دەربارەی لێکچوونی زمانی کوردی لەگەڵ زمانانی دراوسێدا

بڵاوکردەوە . ئــەم نوسینانەیان لە ســەر بناغەیەکی تیۆری یافیتی دارشــتبو . لە بیر و باوەڕی چەوتی ئــەم زانایانە لە لایەن کوردناسەکانەوە رەخنە گیرابو . جگە لەوە ، پاش ماوەیـەك ئۆ. ل. ڤیلچێڤـکی خۆی ددانی نا بە هەڵەکانیدا و بەم بۆنەیەوە نوسیویێتی : « شکی تیدا نییە ، کە زمانی کوردی زمانێکی ئێرانییە . گەر هەندێ وشەش هەبن بە دروست بونیان ئێرانی نەبن و نیشــانی پەیوەندی بدەن لەگەڵ میللەتانی تردا ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا ئەم بەڵگانە هیچ نیشانی ئەوە نادەن کە زمانی کوردی زمانێـکی ئێرانی نەبێت . هەروەها ئەمە هیچ لە زمانی کوردی کەم ناکاتەوە » .

هەرچەندە گ ب ئاکۆپۆڤ وا نیشانی دەدا کە رەخنــە دەگرێ لە تیۆری یافیتی ، بەڵام وەك دەبینین دوپاتی ئــەو بیر و باوەڕە کۆنە ، چەوتە ، لەناوبراوە دەکاتەوە کە هەبو دەربارەی میللەتی کورد و زمانەکەی .

گ. ب. ئاکۆپۆڤ دەربارەی زمانی کوردی نوسیویێتی : « زمانی کوردی — زمانێـکی ئێرانییە . شکی تیدا نییە ، لە دروست کردنی ئەم زمانەدا بەشی ئێرانی دەوری هــەرە گەورەی بینیوە . بەڵام لە زمانی کوردیدا گەلێك وشە و شێوەی وشــە هەن کە ئێرانی نین . ئەمەش نیشـانی دەدات کە میللەتانی خاوەن ئەو وشانەش لە دروست کردنی زمانی کوردیــدا دەوریان بینیوە » ( نامەی دوکتۆری ، ل ٤٠٥ ) .

لە بەشی یەکەمی ئەم چەند دێڕەی سەرەوەدا گ. ب. ئاکۆپۆڤ

دوبارەی ئەو باوەڕە ئاشکرایە ( زمانی کورد لە خێزانی زمانە ئێرانیەکانە ) دەکاتەوە ، کە لە مێژە چەسپێنراوە . دەربارەی دروست بوونی زمانی کوردی باوەڕەکەی ئو. ل فیلچێفسکی دوپات دەکاتەوە : « لە ئەنجامدا ، لەناو جەرگەی کوردستانی ئێستادا ، لەسەرخۆ زمانی کوردی دروست بوو لە گەلێك هۆزی جیاوازی ئاژەڵدار ، کە ئێرانی بوون » . بەڵام لە بەشی دووەمی ئەو چەند دێڕەی سەرەوەدا قەوانە کۆنەکەی ب. ف میللەر و ئـو. ل. فیلچێفسکی لێدەداتەوە ، کە زمانی کوردییان بە یافیتی دابووە قەڵەم .

گ. ب ئاکۆپۆف لایەنی تیۆری یافیتی گرتووە سەربارەت بە نەژادی کورد . بەم بۆنەیەوە نوسیویتی : « زمانی کوردی دروست بوو لە ئەنجامی سەرکەوتنی شێوەی ئێرانی بەسەر شێوەی میللەتەکانی تردا ، کە لە زووەوە لە کوردستاندا بوون . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زمانەکانی تری ئەم ناوچەیە ئەو شتە تایبەتیەیان دا بە زمانی کوردی کە جیاوازی هەبێت لەگەڵ زمانە ئێرانیەکانی تردا » ( نامەی دوکتۆری ، ل ٢٩٩ ) .

بەم شێوەیە ، بە گوێرەی بیر و باوەڕی گ. ب. ئاکۆپۆف زمانی زووی کوردستان ئێرانی نەبوو ، بەڵکو لە ئەنجامی پێشکەوتندا شێوەی ئێرانی سەرکەوت . نوسەر هەتا کاتی ئەم سەرکەوتنەی شێوەی ئێرانی بەسەر دانیشتوانی زووی کوردستاندا دیار کردوە و نوسیویتی : « لە دەوری هاخامەنشی‌دا تا دەوری ساسانیەکان دانیشتوانی کوردستان نە بە ئەتنۆگرافیا ، نە بە ئایین هێشتا شێوەی

ئێرانییان لەسەر نەبو » ( نامەی دوکتۆری ، ل ٢٠٦ ) . پاش چەند دێڕێك ، هەر لە هەمان لاپەڕەدا نوسیویێتی : « لە دەوری عەرەبدا کوردسـتان لە ژێر دەستی ئێراندا نەبو . شێوەی ئێرانی وەرگرتن دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست » . نوسـەر بۆ چەسپاندنی ئەم باوەڕانەی هیچ بەڵـگەیەکی راستی مێژوویی و زمانی نییە ..

زمانناسان و کوردناسان تایبەتێتی فۆنێتیك و گراماتیـکی زمانی کوردییان روون کردۆتەوە ، کە جیاوازن لەگەڵ زمانی فارسی و زمانەکانەی تری رۆژئاوای ئێراندا . لەســەر بناغەی ئەم جیاوازییە گ. ب. ئاکۆپۆڤ وێستوییەتی نیشـانی بدا ، کە زمانی کوردی لە زمانەکانی یافیتی ( ئەرمەنی ، جۆرجی ... ) دەکات . بۆ ئەم مەبەستە لە لاپەرە ٢٠٤ ی نوسراوەکەیدا ئەم چەند وشـەیەی هێناوەتەوە :
« باڤ » ی کوردی و « مام » ی جۆرجی ( باوك — وەرگێڕ ) ؛
« دی ، دیا » ی کوردی و « دێدا » ی جۆرجی ( دایك — وەرگێڕ ) ؛
« ئاسن » ی کوردی و « زنیك » ی ئەرمەنی . لەم نمونانەدا گ. ب. ئاکۆپۆڤ تەماشـای یەکێتی زمانی کوردی و ئەرمەنی و جۆرجی دەکات . ئاشکرایە ، ئەم نمونانە و گەلێـکی تر لەم چەشنە نمونانە ناتوانن ببن بە بەڵـگە بۆ نیشـاندانی ئەوەی ، کە زمانی کوردی و ئەرمەنی و جۆرجی خاوەنی یەك سەرچاوە بن .

ناشـــارەزایی گ. ب. ئاکۆپۆڤ لە زمانی کوردیـــدا لەو شوێنانەشدا دەردەکەوێ کە هەوڵی داوە مانای هەندێ وشـــەی کوردی و ناوی هەنـــدێ هۆزی کورد لێکبداتەوە . مانای ناوی

هەندێ هۆزی کوردی لێکداوەتەوە لەسەر ئەو بناغەیەی کە لە ناو خەڵکا وتراوە . بۆ نموونە : وای داوەتە قەڵەم ، کە وشەی « هەرکیی » پێکهاتووە لە « هەر » و « کی » ؛ وشەی « ئەردەڵان » پێکهاتووە لە « ئەرد » و « ئاڵان » . گ . ب . ئاکۆپۆف وای داوەتە قەڵەم کە وشەی « ئەردەڵان » مانای « خاکی عیلام » دەبەخشێ و وشەی « کوردەڵان » مانای « کورد و عیلام » دەبەخشێ . بەگوێرەی لێکۆڵینەوەی گ ب . ئاکۆپۆف وشەی « کوردەڵان » پێکهاتووە لە دوو میللەتی کۆن : کورد و عیلام . بەم بۆنەیەوە نووسەر دەڵێ : « لە دروست کردنی میللەتی کورددا ، عیلامێکان هاوبەشییان کردووە » . نووسەر لەمەدا هەڵەیە و لە وشەکانی « ئەردەڵان » و « کوردەڵان » دا کەرتی دووەمیان « ئاڵان » نییە ، بەڵکو « لان » ە . هەروەها ئەو ( ە ) یەش کە لە نێوان هەردوو کەرتەکاندایە ، پیتی پەیوەندییە . « لان » بە کوردیی ، واتە « هێلانە ، مەڵبەند ، جێگا . . . » ، بۆ نموونە : « بەردەڵان ، مارەڵان ، میزەڵان . . . » . گ ب ئاکۆپۆف لە بەراوردکردنی وشەدا شارەزایی نییە و کەچی هێرشی بردۆتە سەر ئەو ئەوروپاییانەی رێزمانی کوردییان نووسیوە . ئەو نووسیویەتی : « تەنها لە سۆچێکەوە تەماشای زمانی کوردییان کردووە . تۆزێکی ماوە کە بە هەموو دەنگەکانی فۆنێتیکی زمانی کوردیی بڵێین کوردی نییە و بەڵکو ئەوروپایییە » ( نامەی دوکتۆری ، ل ٣٤٢ ، ٣٤٦ ـ ٣٤٧ ) . بۆ زمانناسان ئاشکرایە و روونە کە ئەوروپاییەکان چییان ویستووە . ویستویانە بەراوردی فۆنێتیکی زمانی کوردیی لەگەڵ

زمانەکانی خۆیاندا بکەن .

گەلێك جار گ. ب ئـاکۆپۆڤ باسی شـتێك دەکات کـە بەباشی تێی نەگەیشتوە . با چاوێك بخشێنین بە باسەکەیدا دەربارەی : رەگـەز و رەگەزناسی ؛ ئاری و ئێرانی ؛ وشەکانی « مار ، مارد ، ماد » ... هتد .

لە لێکۆڵینەوەی جاری یەکەمی ئـەم نوسراوەدا ف. أ. لیڤشیتس نیشانی دا ، کە گ. ب. ئاکۆپۆڤ تێی نەگەیشتوە مانای رەگەز و رەگەزناسی چییە . هەروەها منیش لایەنگیری ئەو باوەڕەی ف أ. لیڤشیتس دەکەم ، چونکە لەگەلێك لاپەڕەی نوسـراوەکەدا ئاشکرا دیارە کە نوسەر باسی هەندێ زانیاری رەگەز دەکات ، کە لە زانستدا ئاشکرا نییە . بۆ ئەمە هەندێ زاراوەی بەکار هێناوە ، وەك دواوە دەربارەی : « رەگەزی یافیتی » ( ل ٢٦٥ ، ٤١٣ ، ٤١٥ ) ، « رەگەزی سـامی » ( ل ٤١٤ ) ، « رەگەزی ئـاری » ( ل ٤١٤ ) ، « رەگەزی ئێرانی » ( ل ٦ ٢ ) ، « رەگەزی عیـبری » ( ٤١٠ ) ، « رەگـەزی هیند و ئەوروپایی » ( ل ٤١٢ ) ، « رەگەزی قەفقاسی » ( ل ٣٨٩ ) .

نوسـەر کە رەخنـە لە تیۆری جیاواز دەگرێ دەربارەی ئەتنۆگرافیا و نەژادی کورد ، هەوڵیشی داوە خۆی ئەم مەسەلەیە خاو بکاتەوە . ئاشکرایە ، کە کوردناسان بە شێوەی جیاواز و دوور و درێژ . لەمەسەلەی نەژادی کورد دواون ، وەك لە کتێبەکەی ئەمین زەکیدا « خۆلاصەی تاریخی کورد و کوردستان » ؛ ف نیکیتین

« کورد » ؛ ڕەشید یاسمی « مێژوی نەژاد و پەی وەستەگی کورد » ؛ ئو. ل. ڤیلچێسکی « کورد » .

دەتوانم بڵێم لەم کتێبانەدا بە تەواوی ڕەخنە گیراوە لە تیۆری جیاواز دەربارەی ئەتنۆگرافیای کورد . هەمو ئەو مەسەلانەی گ. ب. ئاکۆپۆڤ لە نوسراوەکەیدا باسی کردون ، لەو کتێبانەی کە لە سەرەوە ناومان بردن باس کراون . لێرەدا دەمانەوێ بزانین ـ ئەم نوسراوەی گ. ب. ئاکۆپۆڤ چ پەیوەندییەکی هەیە لەگەڵ ئەو کتێبانەی ناومان بردن ؟ .

بەداخەوە ، ددانی پێدا دەنێین ، کە لە لێکۆڵینەوەی ئەم مەسەلانەدا گ. ب. ئاکۆپۆڤ ئەم زانیارییەی بەرەو پێشەوە نەبردوە . ئەو ئەنجامانەی ئەو گەیشتویەتی هیچ جیاوازییەکیان نییە لەگەڵ ئەوانەی کە لە پێش ئەودا گەیشتوینەتێ .

بەشی زۆری ئەم نوسراوە بریتییە لە گێڕانەوەی بیر و باوەڕی گەلێك لە زانایان ، کە دەربارەی ئەتنۆگرافیای کورد نوسیویانە . بەراوردی بیر و باوەڕی شارەزایان و نەشارەزایان دەکات . لە ڕێگای ئەو باوەڕە چەوتەی هەیەتی و کە کورد بە ئێرانیی ناداتە قەڵەم ، هاتۆتە سەر چەند ئەنجامێکی لاواز و دوڕ لە زانست .

ڕەخنەی گرتوە لە ئو. ل. ڤیلچێڤسکی ، کە لە بیر و باوەڕی یافیتیی خۆی وازی هێناوە . لە لاپەڕەکانی ٢٧٢ ـ ٢٨٥ دا دەربارەی ئەو تیۆرییە دواوە ، کە نەژادی کورد بە کاردوخ دەزمێرێ گ. ب. ئاکۆپۆڤ نوسیوێتی : « بۆ یەکەم جار لە زانستدا ن. یا. مارر

له مەسەلەی پەیوەندی کورد و کاردوخ کۆڵیوەتەوە » . بەڵام لە لاپەڕە ٤١١ دا ئەمەمان بەرچاو دەکەوێ : « بیر و باوەڕی چەوت کە هەیە دەربارەی تیۆری یافیتی لـە نەژادی کورددا لەبەر ئەویە ، چونکە هەندێك ناتەواوی هەیە لە تیۆری یافیتیدا » . ( چییە نوسەر دەیەوێ تیۆری یافیتی جیا بکاتەوە لەگەڵ ن. یا. ماررردا ؟ ) .

بیر و باوەڕەکانی گ. ب. ئاکۆپۆڤ دەربارەی پەیوەنـــدی عەرەب و کورد ، تورك و کورد . هـــەروەها دەوری عەرەب و تورك لە دروستکردنی میللەتی کورددا لەگەڵ یەك ناکونجێـــن . گ. ب. ئاکۆپۆڤ دەڵێ : « سۆڤیەتیەکان کە نوسیویێتی — تاسیری ئەدەبی عەرەبی هەیە لەسەر ئەدەبی کوردی ، لە بیری چووە چۆن بەرگی کوردی دەکەنە بەر شێوەی عەرەبی . راستە تاسیری زمانی عەرەبی لەســـەر زمانی کوردی هەیە و ئەمە بێ شکە » ( نامەی دوکتۆری ، ل ٧٢ ) . کەچی هـــەر ئەمەی لە لاپەرە ٧٥ دا بە شێوەیەکی تر وەرچەرخاندوە : « شتێـکی سـەیر نییە کە فۆتێنیك ، وە بەگشتی بەراوردکردنی زمانی عەرەبی و کوردی هیچ بەڵـگەو نیشانەیەك نادەن بۆ دەوری عەرەب لە دروستکردنی میللەتی کورددا » ( نامـــەی دوکتۆری ، ل ٧٦ — ٧٨ ) . هەروەهـــا لە کوتایی لێکۆڵینەوەکەیدا ، واتە لە ئەنجامدا هەر ئەم باسە بە شێوەیەکی تر وەردەچەرخێنێ و نوسیویێتی : « لە دروست بونی میللەتی کورددا میللەتانی جیاواز هاوبەشییان کردوە و یەکێك لەو میللەتانە عەرەبە » ( نامەی دوکتۆری ، ل ٥٥٠ ؛ کورتەی نامەی دوکتۆری ، ل ٥٢ ) .

هەر بەم شێوەیەش دژی ئەو تیۆرییە وەستاوە ، کە دەڵێ لە دروست بوونی میللەتی کورددا ، تورك هاوبەشتی کردووە (ل ٤٥٤ — ٤٨٠ ) . کەچی لە شوێنێکی تردا لایەنگیری ئەم تیۆرییە دەکات . لەم بارەیەوە نوسیویەتی : لە دروست بوونی میللەتی کورددا تورك هاوبەشتی کردووە ( نامەی دوکتۆری ، ل ٥٥٠ ، کورتەی نامەی دوکتۆری ، ل ٥٢ ) .

لە باسی ئەفسانەو سەرگوزشتەی میللەتانی رۆژهەلاتدا گ. ب. ئاکۆبۆف نوسیویەتی : « نە لە ئەفسانەکانی ئاویستادا ، نە لە ئەفسانەکانی تەوراتـدا باسی کورد نەکراوە . ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە لە کاتی نوسینی ئاویستا و تەوراتدا کورد ، وەك میللەتێك هێشتا دروست نەبوو » ( نامەی دوکتۆری ، ل ٢١ — ٥٩ ) ئێمە لەگەڵ ئەو باوەڕە ساکارەی نوسەردا رێك ناکەوین . یەکەم — لەبەر ئەوەی نە ئاوێستا ، نە تەورات ئینسکلۆپیدیای میللەتانی سەرزەمین نەبوون . هیچ یەکێك لەم سەرچاوانە باسی تێکڕای میللەتانی جیهانیان نەکردوە . دووەم — وەك ئاشکرایە ، ئاوێستا لە رۆژهەلاتی ئێراندا پەیدا بووە ، لەبەر ئەوە سەیر نییە گەر باسی کوردی تێدا نەبێ . وەك ئاشکراشە ، لە ئاویستادا باسی دوژمنایەتی دوو کۆمەڵ هەیە : تۆرانیەکان و ئێرانیەکان لێرەدا باسی تاجیك و ئەفغان و تورك و کازاخ و ئوزبێك نەکراوە . بەم جۆرە ، بە گوێرەی باوەڕی گ. ب. ئاکۆبۆف بێت ، ئەوە دەبێ بڵێین ، کە لەو دەمەدا ئەم میللەتانەش هێشتا نەبوون . ئایا دەتوانین وا بڵێین ؟ — نەخێر ، بەڵکو پێویستە

ئەوە لە بیر نەکەین کە تۆرانیەکان – مانای گروپێك لە میللەتانی خاوەن زمانی تورکین ، کە خاوەنی لێکچوونن لەمێژوو و ئەتنۆگرافیـادا . ئێرانیەکان – واتە گروپێك لە هۆزەکانی خاوەن زمانی ئێرانین ، کە وێکچوونیان هەیە لەمێژوو و ئەتنۆگرافیادا . هەرچەندە یەکێتی هەبووە لە نێوانیاندا ، بەڵام لە شێوەی هۆزی جیاوازدا بوون ، کە لەسەرخۆ وەك میللەتانی سەربەخۆ جیا بوونەوە .

کانی گ. ب. ئاکۆپۆڤ لە نوسراوەکەیدا دەڵێ : لە دەوری ئاوێستادا کورد نەبوە ، ئەو خۆی دژی خۆی وەستاوەکە لە وتاری « چەند باوەڕێك دەربارەی نەژادی کورد لە ئەفسانەکانی ئێرانی کۆندا » گ. ب. ئاکۆپۆڤ نوسیویەتی : « لە دەوری دابەش بونی میللەتاندا بەسەر کۆچەرانی ئاژاڵدار و ڕەشماڵنشینی زەوی داردا کورد لە میللەتانی دەوروپشتی جیا بوەوە و بو بە میللەتێکی سەربەخۆ . ئاوێستا سەرەتای ئەم گۆڕانە دەگەڕێنێتەوە بۆ چاخی شاهۆشەنگ ، لەکاتێکدا کە زوربەی خەڵکی وازیان لە ژیانی کۆچەرێتی هێنا . ئەوان (کوردەکان – ق کوردۆ) لەسەر ژیانی کۆچەرێتی و ئاژاڵدارێتی مانەوە »(۲) .

ئەوچەند دێڕەی سەرەوە ، کە لە وتاری ناوبراودا گ. ب. ئاکۆپۆڤ نوسیویەتی ، بە هیچ جۆرێك ناگونجێ لەگەڵ نامەی

---

(۲) گ. ب. ئاکۆپۆڤ ، چەند باوەڕێك دەربارەی نەژادی کورد لە ئەفسانەکانی ئێراندا ، « کتێبی رۆژهەڵاتناسی » ، بەرگ ۱۱ ، یەریڤان ۱۹٦٤ ، ل ۲۳۱ .

دوکتۆرێکەیدا ، کە نووسیویێتی : کورد جیابووەوە و بوو بە میللەتێکی سەربەخۆ لە چاخی پەیدابوونی عەرەب لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا . (کورتەی نامەی دوکتۆری ، ل ١٠) .

لە بیر و باوەڕەکانی گ. ب. ئاکۆپۆڤدا دەربارەی نەژادی کورد ، جیاوازی و نەگونجان لەگەڵ یەکتر زۆرە . لە زۆر شوێنی نووسراوەکەیدا ئەمە بەرچاو دەکەوێ .

ئەوەی زۆر بێ بنچینە و زۆر ساکار بێ لە نووسراوەکەی گ. ب. ئاکۆپۆڤدا ، ئەوەیە کە ویستوویەتی خۆی مەسەلەی نەژادی کورد ئاشکرا بکات . بەڵام بەداخەوە لەباتی ڕوونکردنەوەی مەسەلەی نەژادی کورد ، هاتووە باسی دروست بوونی میللەتی کوردی کردووە لەگەڵ ئەو دەورانەی کە پیایدا تێپەڕبووە .

گ. ب. ئاکۆپۆڤ نووسیویێتی : « بوونی دانیشتوانی کوردستان بە میللەتێک ، لەژێر سێبەری « کورد »دا ، بوو بە هۆی ئەوەی لە سەدەی ٧ دا ناوەکەیان « کورد » بچێتە ریزی « فارس » و « عەرەب »ەوە » (کورتەی نامەی دوکتۆری ، ل ٦٠) . لە نووسراوەکەیدا بەتەواوی لەسەر ئەم باوەڕە سوورە کە دەڵێ : دوان لە کورد لە دەوری پەیدابوونی عەرەب لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا دەستی پێکردووە و بەمەدا دەردەکەوێ کە کورد ، وەک میللەتێک دروست بوو لە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستدا .

ئەوەی ناتەواوی و بێمانایی لێکۆڵینەوەکەی گ. ب. ئاکۆپۆڤ بێت ، ئەوەیە کە مەسەلەی نەژادی کوردی بۆ ڕوون

نەکراوەتەوە و بەرەو پێشەوەی نەبردووە ، بەڵکو چۆن بووە هەر بەو شێوەیە لە جێگای خۆی ماوەتەوە لەو بارەزەداین ، کە نووسەر خۆشی هەستی بەمە کردووە . لە لاپەڕەی ٦٠ ی کورتەی نامەی دوکتۆرێکەیدا نووسیویەتی : « بوونی کورد بە میللەتێك ڕوویداوە لەدەمی دەرەبەگایەتی کوردستاندا » .

لەبەر ئەوەی ، هەر لە شوێنێکدا بە جۆرێکی جیاواز باسی دەکا کە ناکونجێ لەگەڵ باسی شوێنێکی تریدا . بەو بۆنەیەوە دەمانەوێ لە گ. ب. ئاکۆپۆڤ پرسیار کەین : کەی کورد وەك میللەتێك پەیدابوو ؟

لە دەوری پەیدابوونی عەرەب لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ؟ لەدەمی دەرەبەگایەتی کوردستاندا ؟ یاخود لە دەوری دابەش بوونی میللەتاندا بەسەر کوچەرانی ئۆژەڵدار و ڕەشماڵ نشینی زەوی داراندا ؟ .

ئنجا دێینە سەر ئەو ئەنجامانەی نووسەر گەیشتوبەتی لە نووسراوەکەیدا . لە کۆتایی لێکوڵینەوەکەیدا گ. ب. ئاکۆپۆڤ نووسیویەتی : « لە دروست بوونی میللەتی کورددا ، جگە لە ڕەگەزی کورد و باو و باپیری کورد ، ڕەگەزی سامی و هیند و ئەوروپایی و تورکی و ... هتد دەورێکی گەورەیان بینیوە و هاوبەشییان کردوە . بەمەدا دەرکەوتووە کە کورد لە گەلێك ڕەگەزی جیاواز پەیدابووە و ئەمەش لە نووسراوەکانی مێژووناسانی ئەم سەدەیە و مێژووناسانی کورددا چەسپێنراوە . هەروەها ئەم ڕاستیە لە ڕێگای بەڵگەی زمانی و ئەتنۆگرافییەوە باش ئاشکرا بووە . لەبەر ئەوەی

میللەتی کورد لە گەڵێك رەگەزی جیاواز پێکهاتووە ، دیارە کە میللەتێکی رەسەن نییە ، بەڵکو دروست بووە ... » ( کورتەی نامەی دوکتۆری ، ل ٥٢ ) . ئەمە ئەنجامی ئەو باسەیەتی ، کە لە لاپەڕەکانی ٥٣٠ ـ ٥٥٠ ی نامەی دوکتۆریەکەیدا ، بە شێوەیەکی بێشەرمانە لێی کۆڵیوەتەوە .

گ. ب. ئاکۆپۆڤ وای نیشان دەدا ، کە دژی ئەو تیۆرییە چەوتە ، نازاستە دوور لە زانستییانەیە ، بەڵام لە راستییدا وا نییە و لایەگیری ئەو باوەڕانە دەکات ، کە دەڵێ : لە پەیدابونی میللەتی کورددا ، میللەتی عەرەب و تورك و فارس .... هتد هاوبەشییان کردوە ، ئەوە رێگا تەخت دەکا بۆ شۆڤێنێتی ئەمڕۆی فارس و تورك ، بۆ سەرۆکەکانیان بۆ تواندنەوەی میللەتی کورد .

گ. ب. ئاکۆپۆڤ کە دەڵێ : « کورد نەوەی میللەتێك نییە » و بەڵکو « لە میللەتانی جیاواز پەیدابووە » ئەوە ئاگری ئەو شۆڤێنییە تورك و فارس و عەرەبانە خۆش دەکات ، کە کورد بەنەتەوەیەکی رەسەن و سەربەخۆ و خاوەن مێژوو و کولتور و زمانی نەتەوایەتی خۆی دانانێن .

ئەم تیۆرییەی : « میللەتێك خاوەنی چەند رەگەزێك بێت » ، کە گ. ب. ئاکۆپۆڤ ویستویەتی بەسەر کورددا ساغی کاتەوە دەبێ بە چەکێك بە دەستی ئەو قەومیە شۆڤێنیانەوە ، کە کورد بە میللەتێکی رەسەن نازمێرن . بەڵام بۆ مارکسیەکان و دیموکراتیەکان چەکێکە لە رێگای یەکسانی میللەتانی گەورە و بچوکدا . یارمەتی

دەدات بو چەسپاندنی زمانی نەتەوایەتی و مێژوو و کولتوری هەر میللەتێك بە جیاواز .

بۆ ئەرمەنی و ئازربایجانی و میللەتانی تری یەکێتی سۆڤێت هیچ مەترسییەك نییە لەم تیۆرییە و هیچ زیانێك نادات لە سەربەخۆییان و جیاوازییان . لەم میللەتانە هیچ زیانێك ناکەوێ گەر خەیاڵ خاوێك بنوسێت ئەم میللەتانە پەیدابوون لە میللەتانی جیاواز ، یاخود لە شەیتان . ئەم میللەتانە سەربەست و ئازاد بوون ، خاوەنی فەرمانڕەوایی سەربەخۆی خۆیانن . بەڵام کورد لە خەباتی ژیان و نەمان دایە ، لە مەترسی لە ناوچوون و تواندنەوەدایە ....

پشتگیری ئەو تیۆرییە کە « کورد بە میللەتێکی ڕەسەن دانانی » ئەوە مانای ئەوەیە لایەنگیری ئەو مێژوو نوسانە دەگیرێ ، کە مێژووی کوردیان شێواندووە ، ئەمەش مانای ئەوەیە هانی سیاسەتی تورکیا و ئێران دەدرێ بۆ لە ناوبردنی میللەتی کورد .

لە کۆتاییدا دەمەوێ بڵێم : نوسراوەکەی گ ب ئاکۆپۆڤ « ڕەخنەی مێژوویی لە مەسەلەی نەژادی کورددا » ، لە شێوەی نامەی دوکتۆریدا نییە و بۆ وەرگرتنی شەهادەی دوکتۆری ناشێت .

* * * *

# ناوەرۆك

